

لەم
ژمارەیەدا

# کاروان


گۆڤارێکی ڕۆشنبیری ی مانگانەیە

ئەمینداریێتی گشتی ی ڕۆشنبیری لاوان

بەزمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

●

26

●

تشرینی دووەم

1984 ساڵی سێیەم





لە چاپخانەی

(دار آفاق عربیة)

چاپە کراوە

●

نرخی (200) فلسە

ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی

نیشتمانی (483 ـ ساڵ 1982)

لەیادی نەمراندا :

# شێخ مەحمودی حەفید

لەتیف بەرزنجی
هەولێر ـ ئاوایی قەتەوی

شێخ مەحمودی سەرداروپێشەوای گەلی کورد کوڕی (شێخ سەعید) کوڕی (شێخ محەمەد) کوڕی کاك ئەحمەدی شێخی سلێمانی ، دایکی (ئامینە) خانی شێخ بابە رەسول ، (شێخ مەحمود) لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی کانی ئاسکان سالی (1878ز) هاتۆتە دنیاوە .

دەر لەتەمەنی منالیەوە زۆر وریاو گورجو چالاكو نەترس بووە . لە مزگەوت لای مەلا زۆری خوێندووە ، بەتایبەتی لە مزگەوتی گەورە ، کە قوتابخانەیەکی گەورەو بە ناوبانگ لە هەموو پارچەکانی کوردستانەوە بەزۆری مەلاو زاناو فەقێیان روویان تێکردووە .

بارەگای پیاو چاكو شوێنی هەژارو لێقەوماوان و پەنا بەرو بێچاران بووە . لە ناو کوردا جێگەو هەوارێکی پیرۆز بووە .

ئەم بنەماڵەیە لە کوردستانا زۆر خۆشەویستن و رێزی تایبەتییان هەبووەو بەچاوی گەورەو سەرداری ولات تەماشا کراون ، چونکە ئەم خانەدانە چ لە رووی کوردایەتی و چ لە رووی (عیلم و دین) دەورێکی زۆر باش و بالایان هەبووە . وە بۆ خزمەتی گەل و نیشتیمان و رزگاری و سەربەخۆیی کورد درێغییان نەکردووەو قوربانی زۆریشیان داوە ، ئەم بنەماڵەیە پیاوی زۆر داناو بەکەڵکی وەك حاجی کاك ئەحمەدی شێخی سلێمانی و شێخ مەعروف (نودێ) یان لێ هەڵکەوتووە ، کە گەورەترین زاناو عالیمی کوردی ئەو سەردەمە بوون .

هەتاکو ئەم گەلی کوردە مابێ ئەبێ شانازی بەو جۆرە پیاوە زانایانەوە بکات ، شێخ مەحمودو شێخ ئەحمەدو شێخ قادر هەر سێ برا لە خزمەت (شێخ سەعید)ی باوکییاندا دەبن لە (موصل) لە (1908)ز لەو کاتەی کارەساتەکەی (موصل) روو ئەدات ... (شێخ سەعید) لە سەرداوای سولتان عەبدول حەمید چووە بۆ (ئەستەمبول) ماوەیەك لەوێ بە میوانی لە کۆشکی سولتان ماوەتەوەو ئەوجا بەرەو ولات گەڕاونەتەوەو لە شاری (موصل) میوان ئەبن ، وارێك ئەکەوێت لە بەینی هەندێ بازرگانی سلێمانی و چەند دوکاندارێکی (موصلاوی) هەراو شەڕێك روو ئەدات و زۆر گەورە ئەبێت ، چەند پیاوێکی بێ لایەن و ئاشتی خوازی (موصل) ئەچنە خزمەت شێخ سەعیدو داوای لێ ئەکەن کە بکەوێتە بەینی هەردو لایانەوەو ناوبژییان بکات .

(شێخ سەعید) یش (قورئانێك) ئەگرێت بەدەستەوەو رووەو شەڕەکە ئەڕوات و زۆر تکایان لێ ئەکات بۆ ئەوەی ئاگری



شەڕو کوشتارو خوێن ڕژان کۆتایی هات و گەلێك یارمەتی داون لەو تەنگو چەڵەمەیەدا .

بەبۆنەی شەهید بوونی (شێخ سەعید) ەوە لەشکرێکی زۆری کوردەواری دەورو بەری (موصل)و هەولێر ڕژانە ناوشاری (موصل)ەوە ، هاتبوون بەهاواری شەهید بوونی شێخ و هاوڕێکانی یەوەو دریغی یان نەکرد لە دەست وەشان لەو کەسانەی کە بەناهەق ئاگری فیتنەو ئاژاوەیان بەرپاکردو پیاوێکی موبارەکی وەك (شێخ سەعید) یان بێ تاوان لە ناوبرد .

ئەو هەموو لەشکرو سوپایەی بەو هاوارەوە هاتبوون و بەو بۆنەیەوە کۆبوونەوە لەگەڵ (شێخ مەحمود)و (شێخ قادر)و هاوڕێکانیان دا بەرەو شاری سلێمانی کەوتنە ڕێ لە هەموو ناوچەکانی تری وڵاتەوە سوارەو پیادە ملی ڕێگەیان ئەگرتە بەرو بەکۆمەڵ بەیداخی ڕەشیان هەڵئەکردو بەتەپڵو دەف شیعرو شیوەنی (شێخ سەعید) ەوە ئەچوون بەپیریانەوە ، ئەوانیش بە دڵی شکاوو غەمگین بە هەر شارو دێهاتێك دا ڕەت ئەبوون دانیشتوانیان هەموو ڕەش پۆش و خەمبارو تەعزیەدار ئەدیت و بەو شێوەیە پێشوازی ئەکران تاگەیشتنەوە ناو شاری سلێمانی ، ئەو جۆرە لەشکرو سوپاو پێشوازی یەی بۆ ئەوان ڕێکخراوە لەو ڕۆژەدابۆو هیچ سەردارو مەلیك و پادشایەکی بەدەسەڵاتی ئەو سەردەمە نەکراوە . چونکە ، کارەسات و ڕووداوە کاریگەرەکەی (موصل)و شەهیدبوونی (شێخ سەعید)و هاوڕێکانی کاریکی زۆر گەورەی کردبووە سەر هەموو دانیشتوانی کوردستان و وەك چیرۆك و داستان لە هەمووماڵێکی کورددا ئەم ڕووداوە باس دەکرێت و یاد دەکرێنەوەو لە بیرناکرێ ... چونکە زۆر ناڕەواو بێ تاوان لە ناو چوون و بەو شێوەو بەو کارە ساتە دڵ تەزێنە ماڵ ئاوایی یان لەگەڵ و وڵات و کەس و کارکردو هیواو ئاواتەکانی ناو دڵ و دەروونی یان بردە ژێر گڵ و لە گۆڕستانی (نەبی شیت) لە (موصل) هەواری یەکجاری یان گرت و بەخاك سپێران .

ڕۆژانی هەینی زۆر لە دانیشتوانی شاری (موصل)و دێهاتەکانی دەورو بەری ئەچن بۆ زیارەتی قەبری شێخی شەهیدو بە کۆمەڵ خەڵکی بەڕێگەی ئەم گۆڕستانەوەن .

ئێمەش چەند کەسێك بەتایبەتی چووینە زیارەتی گۆڕی پیرۆزی و لەسەر گۆڕەکەی ئەم چوار دێرە هەڵبەستەم بۆهات لێرەدا دەیخەمە بەرچاوی ئێوەی خوێندەواران بەو بۆنەیەوە :-



ئەم فتنەیە بکوژێتەوە بەڵام بێ سوود بوو ، ئیشەکە گەورەتر ئەبێت و (شێخ سەعید) یش لەگەڵ (شێخ ئەحمەدی) کوڕی و (شێخ محەمەد)ی (شێخ عەزیز)و کۆمەڵە لاوێکی چالاك و زرنگی ی کوردی تێدا شەهیدو سەرگەردان ئەبێت ، کە (شێخ سەعید) شەهید ئەبێ هاوڕێکانی ئەویش دەناڵێنە گەرداوی ئەو شەڕو ـ کوشتارەوە .

ئەم کارەساتەی (موصل) لەناو گەلی کورددا زۆر دەنگ ئەداتەوەو گەلێ کاری کردۆتە سەر دانیشتوانی کوردستان بەگشتی و کوردستانی عیراق بەتایبەتی و زۆر نووسەرو شاعیران لەسەر ئەم ڕووداوەیان نووسیوە ، بەتایبەتی نووسەری بەرزو بەناوبانگی کورد مامۆستا (ڕەفیق حیلمی بەگ) لە یاداشتی (شۆڕشەکانی شیخ مەحمود) دا لەسەری دواوە .

گۆرانی ی بێژو گۆیندەو دەرویش تاکو ئێستایش بە دەف و ئاوازو سۆزەوە ئەم ڕووداوە دەگێڕنەوەو لەبیر ناچێ و لەلاپەڕەی مێژووی خوێناوی گەلی کورددا ئەنووسرێتەوە بەخامەی زێرین ، ئەمە لەلایێکەوە لەلایەکی تریشەوە بۆ پاراستن و سەلامەتی (شێخ مەحمودو شێخ قادر)ی برای ، خوا لێخۆش بوو (حاجی محەمەد) ی نەجەف کە پیاوێکی ناودارو بەدەسەڵاتی شاری (موصل) بوو ، چەند ڕۆژێك (شێخ مەحمودو شێخ قادر)ی برای کە دوو لاو بوون خزمەتی کردن و لە ماڵی خۆی ڕێگەی نەدان ئەو دوو برایە بڕۆنە دەرەوە تاکو



ئـەم گـۆڕە شـۆڕە سـوارچاکە نـاودارە
بـەنـاهـەق شـەهـیـد کـرا لەم شـارە
لە بـیرنـاکـرێ خـوێـنـی ئـەم پـیـاوە
شێـخ سـەعیـد لای کـورد نـامـرێو مـاوە

هەر لە ڕۆژی ئەم کارەساتەی (موصل)ەوە گەلی کوردی دوورو نێزیك (شێخ مەحمود) یان بە جێگری هەموو بنەماڵەی کاك ئەحمەدو گەورەو سەرداری ولات داناوە ، لەبەر ئەوەی کوڕی (شێخ سەعید) ی شەهید بـووەو پیاوێکی لێـوەشاوەو نیشتیمان پەروەرو دانابوو .

زۆر دۆستی هـەژارو لێقەومـاوان بوو لە نـاو هـەمـوو چینەکانی گەلدا زۆر خۆشەویست بووە ، بۆیە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان هەڵیان بژارد بەگەورەو سەرۆك و لە هەموو بەش و پارچەکانی کوردستانەوەو لە هـەموو عـەشیرەت و بنـەماڵەو تیرەوەو پیاوە ناودارەکانەوە نامەو نوێنـەرییان بـۆلای شێخ ناردووەو ئامادەیی خۆیـان نیشان داوەو پـەیمانیـان داوە بە سەرۆکایەتی شێخ دریغی نەکەن ، لە پێناوی گەل و ولاتدا . چاوەنواڕی فەرمانی ئەو دەکەن و لەسەر ئەم نەخشە ئەڕۆن ئەو بۆیان دەکێشی و لە ئامۆژگاری دەرنەچن .

جا ئەوەندەی نەخایاند شەڕی یەکەمی جیهانی دەستی پێکردو (شێخ مەحمود) یش داوای کرد لەگەڵ کورد بەشداری ئەو شەڕە بکەن دژی سوپای ئینگلیز کە لە بەسراوە هێرش دێنی بۆ گرتنی عیراق .

شێخ لە سلێمانییەوە کەوتە ڕێ بەرەو بەسراو بە سوپاو لەشکرێکی زۆرەوە لە (شعیبە) لە سـاڵی (1915ز) بەرەنگـاری لەشکری دوژمن بوون و شەڕێکی گەورە ڕوویداو لە ئەنجامی چەند شەڕو کوشتارێك لەو ناوچەیـەدا لەشکری تـورك نەی توانی بەربەستی هێرشی ئینگلیز بکات ، چونکە لەشکری تورك زۆر ماندو بوون کەرەستـەو زەخیرەی ئـەو جۆرە شـەڕەیان نـەمابـوو ماوەیـەکی زۆریش بوو لە شـەڕو شـۆڕدا بـوون ، لەشکری تورك کەوتنە کشانەوەو گەڕانەوە بەرەو بەغدا .

قائیدی لەشکری تورك لەو شـەڕەدا (سلیمان بـەگی عەسکەر)ی بوو کە ئەم کارەسـاتە ئـەبینێ خۆی (ئـەکوژی) لەمەیدانی شەڕدا ، لە داخ و تاوی ئەوەی لەشکری تورك نەی توانی دەوری خۆی ببینێ لەو شەڕەداو بەشکاوی و شپرزەیی قۆناخ بە قوناخ گەڕایە دواوەو سوپای ئینگلیزیش ئۆردوگای لە بەسرا دامەزراند .

سوارەی کوردیش بۆیان ڕوون بووەوەکە سوپای تورك ناتوانێ بەربەستی هێرشی ئینگلیزی داگیرکەر بکات ئەوانیش ناچار دوای خەسارەتو شەهیدێکی زۆر بەرەو ژوور گەڕانەوەو تاکو گەیشتنەوە شاری سلێمانی .

هـەر لەو ساڵەدا لەشکـری (ڕوس) لە ئێرانـەوە هاتـە خـوارەوەو پـەلامـاری سنـووری ڕۆژهـەلاتی کـوردستـانی عیـراقیدا لە (هـەڵەبجـە)و (پێنجـوین) و (ڕەوانـدز) ەوە هاتەپێشەوەو هێرشی هێنا .

(شێخ مەحود)یش وەك سەردارو پێشەوای گەلی کورد سوپای عەشایەری کۆکـردەوەو بەرەو هێـزی (ڕووسەکـان) چوون و پەلاماریان دان و شێرانە هەڵمەتیان بۆ بردن و سوپـای ڕوسیان شکاندو تا ناو کوردستانی ئێرانیان ڕاونان .

بەو شەڕو شۆڕو سەرکەوتنە شێخ مەحمود زیاتر لەناو گـەلی کورددا دەنگی دایـەوەو هەتـا دەهات خـۆشـەویسترو ناودارتر ئەبوو وەلەلای دەوڵەتی عوسمانیش وەك سـەرۆك و سەردارێکی ولات ڕەفتاری لەگەڵ ئەکراو لەقسەو ئامۆژگاری دەرنە ئەچوون ... سوودیان لە ئامۆژگاریەکانی وەرئـەگرت ، زۆریش چاودێریان ئەکردو مەترسیان لێهەبوو لەگـەڵ ئینگلیز ڕێك بکەویت و بەنهێنی پەیوەندیـان لەگەڵ بکـات دژی ئەوان ڕاوەستێ و داوای سەربەخۆیی کورد بکات .

ئەوەبوو زۆری نەخایاند هێزی ئینگلیز گەیشتە بەغداو خۆی باش دامەزراندو عەسکەری دەولەتی (عوسمان) یش لەم ناوچەیەدا نەماو بەرەو (موصل)و کەرکوك هەڵکشان ، مەیدان بۆ سوپای ئینگلیز خۆش‌بوو ئەوانیش کەوتنە پەیوەندیو جوولانەوەو دانانی پیلان بۆ گرتنی ناوچەی کوردستان‌و چەسپانی دەسەلاتی لەو هەرێمەدا .

له 18/ مایسی 1918 عەسکەری ئینگلیز گەیشتە شاری کەرکوك‌و سوپای تورك لەوێ کشانەوە ، (شێخ مەحموود)یش لەو ماوەیەدا پەیوەندی بەکاربەدەستە سیاسی‌یەکانی ئینگلیزەوە کردو داوای لێکردن ئەگەر بەڵێنی بدەنێ بەدامەزراندنی دەولەتێکی کوردی بەسەرۆکایەتی شێخ ئەوا ئامادەیە لەگەڵیان رێك بکەوێت لەو پەیوەندیو گفت‌و گۆیە دابوون ئینگلیز شاری (کەرکوك)یان بەجێ هیشت‌و ماوەی 10 — 15 رۆژ زیاتر نەمانەوە لە شاری (کەرکوك) دوای ئەوان دووبارە عەسکەری تورك گەرانەوە کەرکوك‌و بەسەربردەی پەیوەندی شێخ‌و کاربەدەستانی سیاسی ئینگلیزیان زانی‌و فەرمانیان‌دا بەنهێنی‌و پیلانیان دانا بۆگیرانی (شێخ مەحمود)و لەسلیمانی شێخ یان گرت‌و بەپەلە رەوانەی (کەرکوك) یان کردو لەوێش مەحکەمە کراو (حکم)درا بە ئیعدام لەلایەن مەحکەمەی عەسکەری تورکەوە ، بەلام (عەلی ئیحسان پاشا)ی قائیدی فەیلەقی تورك لە (موصل) کەتازە هاتبووە جێگەی قائیدی پێشو و(خەلیل پاشا)و ئەم (عەلی ئیحسان پاشا)یە پیاوێکی باش بووەو حەزی بەچاکە کردووەو ویستوویەتی لەگەل کورددا دۆستایەتی بکات چونکە ئیشیان بەکورد هەبوو لەوکاتەدا بۆیە بەپەلە (شێخ مەحموود) یان داواکرد کە بەبەندی لە کەرکوکەوە ڕەوانەی (موصل)ی بکەن گەیشتە ئەوێ زۆر ڕێزیان گرت‌و عەفویان کرد لەو حوکمەی لە کەرکوك درابوو ، دوای میوانداریێکی باش زۆر بەدلشادیو رەزامەندی گەڕایەوە بۆ سلیمانی ، لە دوای چەند هەفتەیەك (عەلی ئیحسان پاشا)ی تورك بروسکەی بۆ قائیدی عەسکەری خۆیان کرد لە ناوچەی سلێمانی داوای لێکردن کەوا ئیدارەی هەرێمی سلیمانی بە (شێخ مەحموود) ئەسپێرن‌و ، عەسکەری تورکیش لە ژێر فەرمانی شێخ‌دا ئەبێت ، بەلام ئەم مەسەلەیە زۆری نەخایاندو دووبارە عەسکەری ئینگلیز گەڕایەوە (کەرکوك)و باری سیاسی‌ی نێوان شێخ‌و تورکی‌ی گۆڕی‌و شێخی مەزن دوای ئەم گۆڕانە ناچاربوو بۆ بەرژەوەندی گەلی کورد یاداشتێك (مذكرة) یەك بۆ کاربەدەستانی ئینگلیز بنێرێتە بەغداو داوایان لێ بکات‌و ئامادەی خۆی نیشان بدات بۆ رێك‌کەوتن لەگەڵیان لە سەرئەو (خال‌و مەرجانەی) بۆ دامەزراندنی دەولەتێکی کورد کە داوای کردبوو ، ئەگەر ئەوان بەوە رازی‌بن . ئەوا شێخ ئامادەیەو بە ئاسانی دەست بەسەر سلێمانی‌دا دەگریت عەسکەرو کاربەدەستانی تورك لەوێ دەردەکات . دوای چەند رۆژێك وەلامی یاداشتی شێخ درایەوەو بەپەلە حاکمی سیاسی کەرکوك (میجەرنوئیل) یان‌تەرخان کرد کە بچێ بۆ سلێمانی‌و لەگەل شێخ لەو بارەیەوە گفتوگۆ بکات‌و بەپێی نەخشەی دەولەتی بەریتانیا ئەو کارە بکات .

(میجەرنوئیل) چوو بۆ ناوچەی سلێمانی‌و لە دەرەوەی شار پێش‌وازی کراو دوای گفت‌و گۆی بەینی نوێنەرانی هەردوو لا بریار درا شێخ ببێ بە (حوکمداری کوردستان)و (میجەرنوئیل) ببێ بە (مستشار) و مامۆستا رەفیق حیلمی بەگیش ببێ بەنووسەری شێخ .

ئینجا شێخ فەرمانی‌دا عەسکەری تورك چەك کران‌و هەموویانی رەوانەی (موصل) کردەوەو بۆ ناو هێزی تورك . شاری سلێمانی بووە پایتەختی (حوکمداری کوردستان) ، بەلام هەرلەیەکەم رۆژی دامەزراندنی حوکمداریەتی کوردستانەوە ، ئینگلیز خەریکی پیلان‌و فڕوفێل بووە بۆ ئەوەی دەسەلاتی شێخ کەم بکەنەوەو سنووری دەسەلاتی حوکمدار فراوان نەبی‌و عەشایرو تیرەکانیان لێ هان ئەدان‌و خەریکی دوو بەرەکی بوون لە بەینیان‌دا .

شێخ (مەحموود) یش هەستی بەو نیازە گلاوەی ئەوان کردبوو بۆیە نەیتوانی زیاتر چاو پۆشیان لێ‌بکات‌و لە رۆژی (20 و 21) مایسی سالی (1919) فەرمانی دا بەگرتنی هەموو کاربەدەستانی ئینگلیز جگە لە (میجەرسۆن) لەوکاتەدا سەفەری کردبوو .

کاربەدەستانی سیاسی ئینگلیز کە بەدەنگو باسی گۆڕانی سلیمانی‌یان زانی ، بەزۆری هێزێکی گەورەیان کۆکردەوە لە بەغداو کەرکوك‌و هەولێرەوە هەموویان بەرەو (سلێمانی) کەوتنە ڕێ‌و ، سوپاو لەشکری کوردیش بەسەرۆکایەتی شێخ مەحمودی نەبەز لە دەربەندی بازیاندا پەلاماریان دان‌و

شەرێکی زۆر گەورەوگران رووی دا ، لەو دۆڵو ناو شاخ و دارو دەوەنەدا ، هەندێ لە کوردە نۆکەرەکانی ئینگلیز زۆر دەوری خراپیان نـواندبـوو ، بۆ شکـانی لەشکری کـورد ، لە دوای شەرێکی خوێناوی قوربـانی دانێکی زۆر (شێخ مـەحمود) لە ئەسپەکـەی کەوتـە خوارەوە بـەبرینـداری چووە پـاڵ بەردە قارەمانەوەو ئەم بریندار بوونەی شێخ زۆر کاری کـردە سەر وورەی شـۆرشگێرانی کـوردو دوای شەرێکی گـەورە شێـخ بەبرینداری کەوتە دەست دوژمن . بەپەلە رەوانەی (بـەغدا) یان کرد . لەو شەرەدا زیانی گەلی کورد (200) شەهیدو (80) بریندار بووەو ، هەندێ لەو سەرکردەو پیاوە نـاودارانەی لەو شەرەدا شەهیدبوون ئەمانەن :

1 ـ حاجی سەید حەسەنی مامی شێخ مەحمودی (مەلیك) .
2 ـ شێخ سەعیدی گۆبتەپەی سەنگاو بەبرینداری ئەگیرێو ئەمری خودا دەکات لە چەمچەماڵ قەبرەکەیشی لەوێیە
3 ـ شێخ باهیری شیخ مەحمودی گۆبتەپەی سەنگاو .
4 ـ مەحمود رەشیدی جوامێری هەمەوەند .
5 ـ تاهیری حەمەدە فەندی سلێمانی .
6 ـ مدیری پۆلیسی شیخ مەحمود .

لەکاتی نووسینی ئەم وتارەدا لە دەربـەندی بـازیانـدا رۆژێك ئەچـووین بۆ سلێمـانیو یادی ئـەو شەرەی بـازیانم کردەوەو چاوم بـەبەردە قـارەمان کـەوتو ئەم چـەند دێـرە شیعرەیشم بۆهات بەو بۆنەیەوە لێرەدا پێشکەشتانی دەکەم :

### لە دەربەندی بازیان

تـەقـەی بـرنـەوە شـەسـت تـیـرە
دەنـگـی لاوی ئـازاو ژیـرە
بـانـگ دەکـەن شـێـخـی قـارەمـان
ئـەمـڕۆ هـەولێـك بـۆ کـوردسـتـان
بـۆنـیـشـتـیـمـانـی بـەش کـراو
ولاتـی کـوردی بـەجـێـمـاو

جگە لە شێخی مەزنو شێخ حەمەی غەریب چەند ئەفسەرێکی چالاكو نیشتیمان پەروەریش لەگەڵ ئەواندا لەو شەرە کەوتنە دەست هێزی دوژمنو رەوانەی بەغدا کران بە بەندیو ئەویش ناوەکانیانە :ـ

1 ـ قادر ئەفەندی قەرەداخی
2 ـ عیزەت تۆبچی
3 ـ قالەی ئایشەخان
4 ـ رەشید جەودەت
5 ـ رەشید غەفوور
6 ـ ئەدهەم ئەفەندی
7 ـ عەلی یاوەر ،

لە دوای ئەوەی شێخ لە نەخۆشخانە دەرچوو لەگەڵ شێخ (حەمە غەریب)ی قازانقایە درانە مەحکەمەی عورفیو حکم‌درا بە (اعدام)و شێخ حەمە غەریب (5) ساڵ .

شێخ مەحمود ئەو مەحکەمەو حوکمەکاری لێ نەکردبوو بەلام داخی ئەوەی ئەخوارد چەند کوردێکی نۆکەر هاتبوون بۆ ئەوەی بەناهەق لەسەر شێخ قسە بکەن واتا (شاهیدی) بدەن دژی ئەوان بۆ قازانجی دوژمن ، بەلام شیخ زۆر بە توورەیی تەماشای شاهێدەکانو کاربەدەستـانی مەحکـەمەی کـردوو ووتی : ئێوە دوژمنی منو گەلی کوردن ، بڕیاری عادیلانە بـۆ ئێمە نادەن ، بۆیە ئێمەیش بەبڕیارو حوکمی ئێوە رازی نابین . من بـۆ ئازادیو سـەربەخـۆیی گـەلی کـورد بـەڵێنم لە ئێـوە وەرگرتووە ، بەلام ئێوەی ئینگلیز راستتان نەکردو بۆیە منیش ئەبێ بەزمانو بەچەك ئەو خەباتو داوایە بکەم . بەو شێوەیە شێـخو شێخ حـەمـە غـەریب حـوکم دران دوای مـاوەیـەك حوکمەکەیان گۆڕاو بووە دوور خستنەوە بۆ هیندستانو لەوێش رەوانەی جەزیرەی ئەندامانو (تافە) کران تا ساڵی (1922) لە هیندستان ئەمیننەوەو ئەوجا لەوێوە رەوانەی کوێت دەکرێنو مانگێك میوانی ئەمـیر دەبن ، ئەوجـەند سـاڵەی شێخ دوور ئـەخرێتـەوە شەڕو شـۆڕو جووڵانـەوە لە کوردستـاندا هـەر ئەمێنێو کۆتایی بەشەڕی چەتەگەری نەهاتو لە بەشی زۆری

ناوچەکانی کوردستاندا لە شکری ئینگلیز هەراسان کرابوون ئەوەندەی هێرشیان ببەنەسەر بەتایبەتی سوارەو چەکدارو پێشمەرگەکانی شێخانی ناوچەی سەنگاو جەباریو قەرەداغو هەمەوەنـدو سمایـل حوزێـریو جافو شـوانو شێخ بـزێنی درێغییان نەدەکرد لە دەست وەشاندن لە عەسکەری دوژمن .

شێخ عەبدولقادری گۆبتەپەو شێخ مستەفایی کوڕیو کەریم فەتاح بەگیی هەمەوەندو شێخ عـەلی قەلبـەزەو شێخ مستەفای شێخ عەلی زۆر دەوری بالایان هەبووە لە پەلامارداني دوژمنو بەرپاکردنی شەڕو شۆڕی چەتەگەری تاکارێکی وایان کـرد دەولەتی بەریتـانی ناچـارو مانـدو بکـەن ، فـەرمـانی گەڕانەوەی شێخ بدات بۆ ئەوەی شەڕو کوشتار کۆتایی بێتو ولات هێمن ببێتەوە .

لە سـالی (1922)م دەروێشی شەریفی دلسـۆزی شێخ لە سلێمانییەوە رەوانە دەکرێت لەلایەن شێخانی سلیمانییەوە بۆلای شێخ بۆ کوێت بۆ ئەوەی (بـڕیار)ی گـەڕانەوەیـان زوو پێبگەیەنیو دەگەڕێنەوە بەغداو شێـخ لە خانـووی (نەواب) لەگـەڕەکی (کەرخ) میـوانی دەولەت ئەبێو پاش ماوەیـەك بەقەتار لە بەغداوە بەرەو کەرکوك دەگـەڕێنەوە ئینگلیـزەکان لەبەر مەترسی پێشوازی سوارەی کوردو رێگەیـان نەدا . لە کەرکوکەوە بگەڕێنـەوە چونکـە بە هـەزاران سوارەو پیـادەی ناوچەی قەرەداخو بازیانو گەرمیان گەیشتنە ناوچەی کفریو شێخ لەوێدا دا دەبەزیو دەچێتە مالی سەید (عومـەر ئاغـا) لەوێشەوە بەناو داودەو تالەبانیو بناری گـلو قادر کـەرەمو زەنگنەو مەملەحە (خوێڵین)و دەشتی سەنگاو دێ هەشەزینی دەربەندی باسەرەو دیلێـژەو سولە ، بـەو سوپـاو لەشکرەوە گەیشتنەوە (داری کـەلی) ماوەی (10)رۆژ لە دێی داریکـەلی ئەمینێتەوە ئەوجا ئەچنەوە شاری سلێمانیو پێشەوازییەکی زۆر گەورەو گەرمو گوڕ ئەکرێت دووبارە لە (14) ی ئەیلولی سالی 1922 ئەکرێتەوە بە حوکمدارو پایتەختەکەشی هەر سلێمانی دەبێ تا سالی (1924) حوکمداریو فەرمانـڕەوایی دەکات دیسـان لەگەل ئینگلیز تێك دەچێتەوەو شار چۆل دەکـەنو ئینگلیزیش بەفڕۆکە بۆردومانی دەکات ئەوانیش دەچنە دولی سورداشو ئەشکەوتی (جاسەنە) بە بۆنەی ئەو بۆردومـانەوە شـاعیری نیشتیمان پەروەر (حـاجی میرزا عـەبدوللای سـەقزی) ئـەو هەلبەستەی داناوە لێرەدا دەیخەینە بەرچاو :ـ

## یاران

**یـاران بـەخـودا ئـەمـرۆکـە ئـەوقـاتـی دوعـایـە**
**بـۆ زاتی (مـەلیـك) چـونکـە شـەوو رۆژ لە غـەزایـە**
**تـەیـارە هـەمـوو لەحـزە لە کـەرکـوكو لەبـەغـدا**
**بـۆ کـۆمـەکی ئینگلیـزە بـەچـەرخـە لە سـەمـایـە**
**هـەر دێتو دەچێ خـۆی دەنـوێنێ بـەهـەمـوو رەنـگ**
**قـابیـل نییـە ئـەم ئیشـە هـەمـوو مـەیـلی خـودایـە**
**بـۆ دەفعی بـەلا حـەزرەتی (عثمـانـە) دوعـاگـۆی**
**دل دۆزی (عـدو) تـیـری عـەلی شـیـری خـودایـە**
**بـۆ چـەتـری سـەری حـەزرەتی کـاك ئـەحمـەدە دایم**
**دوشـمن بـەمـەلیـك دوشـمـن دۆسـتـانی خـودایـە**
**بـۆ کـۆمـەمەكو یـەك رەنگی خودا حـەقـە کـەریم بـەگ**
**بێ میسـلو نـەزیـر بـۆ لە جیهـانـدا کـە وەهـایـە**

ئـەم پارچـە هەلبـەستەی میـرزا عەبـدوللا بەبـۆنەی بۆردومانی سلێمانییەوە وتراوە ، میرزا عەبدوللای سەقزی کە لەدەست رەزا شای ئێران رای کردبوو هـاتبووە سلیمـانی لە دەوری حوکمداری شێخ مەحموددا لە سلێمانی کۆچی دوایی دەکـاتو لە گردی سـەیوان نێـژراوە . شێـخو سـەرکـردەو کاربەدەستەکانی لە ئەشکەوتی (جاسەنە) رۆژنامەی (بانگی حەق) یان دەردەکرد سەرنووسەری (مستەفامەزهەر) بووەو هەلسورێنەری تەلەغراف مامۆستا شـاکر مـوجریم بـووە ، شێـخو لەشکرەکـەی تـاسـالی (1926) لەو شـاخو کێـوانـەی قەرەداخو ماوەتو هەورامانو سورداش ماوەتەوەو لە دواییدا چوویتە کوردستانی ئێرانو لە ناوچەی (مەریوان) جێگیربووە تاشەری (1931)م ئاوباریك کە لەم شەڕەدا شێخانی گۆبتەپەو کەرەبچنەو قادرکەرەمو جـەباری کـانیکەوەو هـەشەزینیو قـەرەداخ دەورێکی زۆر بـالایـانبـووە بـەتـایبـەتی شێـخ عەبدولقادری گۆپتەپەو شێخ عەلی قەلبەزە دەوری زۆر باشیان بـووە ، شێخ عـەلی لەو شەڕەدا شـەهید بـووە بەلام شێـخ مستەفای کوری کە پێشمەرگەیەکی ئازای ئەو سەردەمە بووەو ئێستاش ماوەو زۆر لەسەرخۆیەو زۆر دەوری ئازایەتی بووە ،

ئێستا لە دێی (ئاوایی حەمەی کەرەم) لە قەرەداغ دادەنیشێ و سیحەتی زۆرباشەو تەمەنی (80) ساڵ دەبێ ، لە شوێنێکی تردا بەدوورو درێژی لەسەر ئەم باسەدە دوێین . لە دوایی شەڕی ئاوباریك شێخ لەگەڵ کاربەدەستانی میری دەکەوێتە گفتوگۆ بۆئەوەی (عەفوی) بکەن بەڵێنی دەدەنێ و دەگەڕێتەوە بۆ ناو شارو ئەیگرن و بەدەست بەسەری ڕەوانەی دەکەن بۆ (ناسریە)و لە دوایی‌دا ئەیهێننەوە بەغداو جگە لە شێخ مەحمودی مەلیك شێخ عبدالقادری گولەنەبردو شێخ عبدالکریمی قادرکەرەم و شێخ ئیسماعیلی کوڕی شێخ عبدالکریم و سەید ئەحمەدی مەرەخەس و سەید ئەحمەدی خانەقای کەرکوك . دوردەخرێتەوە بۆ بەسراو ناسریەو بەغدا لەسەر ئەوەی پشتگیری شۆڕشی شێخ مەحمودیان کردووە یا بەشداری ئەو شۆڕشە بوون ، شێخ مەحمود تا ساڵی (1941) لە بەغدا ئەمینێتەوە لەکاتی شەڕی ڕەشیدعالی گەیلانی هەلی بۆ هەڵ دەکەوێت خۆی دەگەیەنێتەوە ناوچەی بازیان لەدێی (داری‌کەلی) دادەنیشێ تا ساڵی (1956)م لەوساڵەدا نەخۆش دەکەوێت بەنەخۆشی دەیبەنە نەخۆشخانەی (حەیدەری) لە بەغدا لەشەوی 1956/10/9م کۆچی دوایی دەکات پێش مردنی سەعات (11) ی شەو شێخ جەعفەری کاکەلاو کە پیاوێکی زۆر دڵسۆزبوو بۆ بنە ماڵەی کاك ئەحمەدو پێی ئەڵێ (3) وەسیەتم هەیە بۆم جێبەجێ بکەن چونکە ئەمجار بەم نەخۆشیە دەمرم :

**1 - حەجم نەکردووە بۆم بکەن .**

**2 - واریداتی دێیەك بکەن بەخێرات بۆم .**

**3 - حەزم دەکرد لەبەغدا نەمرم و لەوشاخ و کێوانەی کوردستان بمرم و قەڵ و داڵ گوشتەکەم بخوات بەلام شتێکم بۆ (کورد) بکردایە .**

لەبەغداوە تەرمی پیرۆزی سەرۆکی کورد شێخ مەحمودی نەمر بەرەو سلێمانی کەوتە ڕێ و لە هەموو شارو ناوچەکانەوە خەڵکی بە پیری جەنازەی ئەم تاقە شاسوارەی کوردەوە دەچن و پێشوازی‌یەکی زۆر دەکرێت .

شاری سلێمانی پیاوژن دێنە سەرشەقامەکان و بەسروودو شێوەن ئەچنە پیری جەنازەی شێخەوەو لە ئەنجامی ئەوە لە بەینی چەند لاوێکی خوێن گەرمی سلێمانی و پۆلیس‌دا ئەبێ بەشەڕو تەقەو کوژراوو برینداری لێ پەیدا ئەبێ و زۆر کەس لە دانیشتوانی شار دەگیرێن و ڕەوانەی کەرکوکی‌یان دەکەن . (شیخ لەتیفی شیخ مەحمود) یش کەلەو کاتەدا لە سلێمانی بەندبووە ئەویش شەو بەپەلە ڕەوانەی دەکەن بۆبەسرا لەوێ لە بەندیخانە دەمینێتەوە تاساڵی (1958)و لە ڕۆژی (14)ی تەمووز بەرئەبێ و ئەگەڕێتەوە سلێمانی .

**شێخ لەگەڵ خوێدا «پێنج» برا بوون کە ئەمانەن :**

**1 - شێخ محەمەد .**

**2 - شێخ مەحموود .**

**3 - شێخ قادر .**

**4 - شێخ ئەحمەد .**

**5 - شێخ برایم . «کە بە سەید برایم مەشوورە» .**

«شێخ محەمەد» یان بە هۆی شۆڕشی شێخ مەحموودەوە دەربەدەر بووەو لە دێی «بێتوش» ماوەتەوەو هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە .

شێخ ئەحمەدیان وەك لەپێشەوە باسمانکرد لەگەڵ باوکی شەهید کرا .

(سەید برایم) یش بەنەخۆشی سێ ساڵ لەمەوبەر کۆچی دوایی کردووە لەسلیمانی .

شێخ مەحموود سێ کوڕو یەك کچی هەبووە :-

**1 - شێخ ڕەئووف**

**2 - شێخ باباعەلی**

**3 - شێخ لەتیف**

**4 - حەلاوە خان**

لە کوڕەکانی تەنها شێخ باباعەلی یان ماوە کە پیاوێکی داناو نیشتیمان پەروەرو دڵسۆزە ، وەك کوردێکی بێ‌لایەن و ئاوارە لەشاری (لەندەن) دانیشتووە . بەو شیوەیە شریتی عومری شێخ مەحمودی مەزنی کورد پێچرایەوەو لە بارەگای کاکە ئەحمەدی شێخ لە سلێمانی هەواری یەکجاری گرت و ماڵ ئاوایی لەگەڵ و نیشتیمان کرد .. ئیتر تاکو گەلی کورد مابێ ئەم پیاوە ناودارە لەبیرناکاو یادی ئەم شۆڕە سوارە ئەکاتەوە .

محەمەد عەزیز مەلا ڕەحیم

# "ڕازی تەنیایی"و

## ڕازێکی بەسەرکردنەوەی "هەردی"ی شاعیر

(ڕازی تەنیایی) بەرهەمی سەرەتاو دوابەرهەمی (هەردی) شاعیرە کە لە نیوەی دووهەمی پەنجاکانەوە هەتا ئێستا دیدەی خوێنەران و ئەدیب و ئەدەب دۆستانی پێ مەستبووەو پێی مەست ئەبێت .. ئەو بەرهەمانەی کە لەم بەرگەدا کۆکراونەتەوە دەستە گوڵێکی نەمری دوور لەوەراندنن کەپڕ بە پڕی گوڵزاری شیعری کوردی‌یان ڕازاندۆتەوە بە بۆن و بەرامی داهێنان و باوەش‌کردنەوە بۆ ئەو دنیایەی کە سەرتاپا لە سەرچاوەی ڕاستەقینەو دەر بڕینی ڕەسەنی کوردی‌یانەوە هەڵقولاوە ..

ئەگەرچی ئەو شێوازو شەقڵە لەو سەردەمەدا کەم هەستی پێ ئەکراو کەم قەڵەمیش خۆی لە قەرەی دەربڕینی ئەدا .. بەڵام هەرچۆنێ‌بوو (هەردی) بەو چەند شیعرە توانی لە مەیدانی (شیعری تازە)دا چەند ئاوازێ لە تەلی ئەو شیعرانەوە تێکەڵ بە لاوکی کوردی بکات و وەك ڕۆشنبیرێکی بەر پرسیار دەربڕین لەو دەروون و هەڵوێستە ئاڵۆزەی لاوی کوردی بکات کە وەك داستان پاڵەوانی چەندەها کۆڕی دڵ گەرمکەرو هەوێنی دڵ نەوایی بووە ..

سەرەتای دەست پێ‌کردنی ئەم هەنگاوانە لە ئاڵۆزێکی ون‌بووووەوە سەر هەڵ‌ئەدا کەوێنەیەکی ڕاستەقینەی خۆشەویستی‌و شی‌کردنەوەی بە زەبری شاعیرن .. ئەویش بەوەی بۆ بەدیارکردنی هەموو مەبەستێکی نادیار زیاتر ئەیەوێ لە دژایەتی‌یەکی بەردەوامدا بژی بۆ ئەوەی بتوانێ وەك خاوەن مەبەست دەسەلاتێکی تەواوی هەبێ تا بتوانێ ئەوەی دەیەوێ چەسپاو بیهێنێتە دی .. نەك لە گەڵ گۆڕانی بارو دۆخی سروشتیا ئەمیش لە گرێژەنە دەرچێ‌و شیرازەی گەش‌بینی دیوارێکی هەرەس پێ هێنراوی ڕەش بین بەرپەچ بداتەوە ..

ئەمەی دەی‌لێم لە (ڕازی تەنیایی) (هەردی) دا هەن‌و دەقاو دەق بەڵگەی ڕاستیمان ئەدەنە دەست وەك دژایەتی‌یەکە :

توانیویەتی مله بە ملانێ‌یان بوەستێ‌و لە بارە دەروونی‌یەکەوە وەك هێزێکی دروستکەر دژ بە پیلانی ڕووخێنەرو نەخشەی تێك شکێنەر سەر لە نوێ کاروانی هیوا بگرێتەوە بەرو چۆك دابدات بۆ بەهەشتی دنیای تازەو هەتا هەتایە دڵداری ووشەی پاك‌و سۆزی نوێی مرۆڤانە بێ ..

بەڵام دوبڕین‌و داڕشتنی ئەم چەشنە هەستانە کە تێکەڵ بە سۆزو ئەندێشەی پەنگ خواردوون کیشوەرێکی فراوانی ناخی ئەوێ کە پۆلی خواروو سەرووی لێکدانەوە بکەیەنێ بەیەك بۆ ئەوەی لە ڕوانگەی وورده کاری‌یەوە بتوانێ دنیای فراوانی داهێنەر بە داهێنان‌و جوانکاری لە ڕشتەی هەستا بە تابلۆیەکی شیعری بنەخشێنێ ...

سەرەتا (چەپکە گوڵێك بۆ ست فاتیمە) دەکەینە پێشەنگ‌و بزانین ئەم چیرۆکە شیعرە ڕیالیزمی‌یە کە تیای‌دا داڕشتنی زەمینەی بیری شیعرەکە هەوێنێکی دژایەتی‌یە چۆن لە وەسفە

(مثالی) یەکەوە ڕێچکەی غەزەلی بەرنەداو لەسەر پەردەی باس چیرۆکێکی تاڵو ناخۆشی (دلداری وولاتی ئێمە) لە ناوەرۆکی بابەتەکەوە ئاراستەی خوێنەر ئەکات :

**گـەرچـی دڵداری لە خـاکی ئـێمـەدا ئـەفسـانـەیـە**
**هـەر بـە تـەنیـا بـۆ کـوڕی خـاوەن تـەلارو عـانـەیـە**

ئەم دێرە شیعرە زمانێکی ڕاستگۆیانەی پڕ لە تامەزرۆییو تاقیکردنـەوەی هەستی شـاعیرە کـە یەکێ لە ڕازە حـەشار دراوەکـانی دەروونی لاوی کورد لە پـاڵ چەنـدەهـا ئـاواتو خـواستی بێ شێـلبـووی تـرا وەك ئـاوێنـەیـەکی بێ گـەرد ئەداتەوە .. کەتا ئـەمڕۆ بـایەخێکی سـەردەمنو وێنەیـەکی قۆناخی کۆمەڵایەتیمانو ڕەنگ دانەوەیەکی بە هێزی چینایەتین کە هاوڕێکەی ناکۆکی میللییە ئاڵۆزەکەیە ، وەك بەربەست لە ڕێی لە چەندەها هەنگاوی پێشکەوتن گرتووە ..

ناوەرۆکی ئەم شیعرە لە برەوو بـایەخـدا لە پلەی ئەو شیعرانەدایە کە تائێستاش سرووودێکی سەرزارەو زمان پاراوی هونەرمەندانەی لە بۆتەی قووڵ بوونەوەو خەستبوونـەوەی مەعنەوی هەستا تیا بەدی ئەکرێ ..

لێرەدا شاعـیر پێی لەوە ناوە هـۆیەکی تـر ئەویش کـە دەسەلاتە مـادی یەکـەیە تـەگەرەیـەکی بنەڕەتـە بۆ تـەشو ئەماکردنی گەرای یەکێ لە دەردەکانی کۆمەڵ لە پـاڵ دەردە ئابووریو سیاسیو کۆمەلایەتی یەکانا .. بۆیە ئەم تێبینی یـە گـەورەیـەمـان لە گـەرمـەی دڵداریو خـۆشـەویستی وەك مامەڵەیەکی ژیان پێ نیشان ئەداو ئەیەوێ پەنجەی نارازی بۆ ئەم هەڵسو کەوتە نا قۆلایە ڕابکێشێ لە بۆتەی (بڕۆتستـۆ)ی ڕەخنەگرانەی خۆیدا :

**خـۆشەویستی وا کـە نامـەی خوایـە بـۆ پێغـەمبـەران**
**بـەرزو ناسـك وەك هەنـاسـەی پـڕ گـوڵاوی دولبـەران**
**نـەك وەکـو حـەزکـردنی دینـارو گـەوهـەر پـەروەران**
**ئـەوکـەسـانـەی بـۆ قـڕانێ چـەنـدە دڵیـان هـەڵوەران**

داهێنانو نوێبوونەوە لە بەرهەمی داهێنەردا بە تایبەت شیعر .. بەردی بناغەیان لەسەر پێش بینیو وورد بینی ژیریو شارەزایی لە دەربڕینو گرنگیدان بە پەیوەندی دەروونی یەوە هەڵدەسێ .. ئەمـانیش پشت بە جـوانیو بیر دۆزی داهێنـانە ئەبەستن کە ئەمیش پەیڕەوو پرۆگرامی تـایبەتـانەی خـۆی ئـەیگـرێتـە چـوارچێـوەی ڕێـك خستنو دانسقـەیـی لە هەڵسەنگاندنا ..

ئەگەر داهێنان شێوەیەکبێ لە شێوەکـانی بلیمەتی .. هیـچ گومـانی تیا نییـە (چاوەڕوانی بێهـودە) بەرهـەمێکی پێگەیشتوو پڕ بە واتای داهێنەرانەبێ .. ئەویش بەوەی لەو سەردەمەوە هەتا ئێستەش کۆششێکی نوێی شاعیرانەیە لە بـواری هونـەری جوانی شیعـریو تایبـەتمەنـدی لە ووشە سازیو هەڵچوونی ڕەسەنی دەروونیدا ..

سەرکەوتنی هەموو بـەرهەمێکی شیعـری چ لە ڕووی داهێنان وە چ لە ڕووی داهێنەرەوە بەوە دەبێ کە سەرانسەر لە بەهەشتی بەرینی خۆزگەو دنیای فراوانی مەبەستی خوێنەرا بتوێتەوە .. ئەوەی دەی ڵێم تایبەت نەبێت بـە سوودی تـاکە کەسی یەوە بەڵکو لە هـەستی دژوارانەو ڕەسـەنایـەتیو نوێ بـوونـەوەوە بێ کـە ئـەمیش سـەرجـەم لکاوە بـە سـوودە گشتی یەکەوە ..

بۆیە (هەردی) بەم وەسفەی لە (چاوەڕوانی بێهودە) دا دەروونی ئەو خەڵکەی کردۆتە فەرهەنگێکی (زانیاری جوانی)و تیایدا سەودا سەری ووشەی تەڕو هەستی ناسكو دارشتنی بە بڕشتی شاعیرانەیە .. وە ئەگەر ئەمە نەبوایە ئەبوو کە هێزی داهێنەرانەو ڕەوشتی داهێنان بێبەری بوایە لە کـەسایـەتی (هەردی) و بمان ووتایە : ئەم هەنگاوانە لەڤییەکر، دەروونی کاتیو بە گڕیەکا چۆونێکی بەرژەوەند پەرستانەوە هاتووە .. ئـەگەرچی (جـوانی) لە جوانییـەکەوە بـۆ جوانییـەکیتـر ئـەگـۆڕێو بگـرە زۆر جـار لە مـەست بـوونو کـار دۆستی هەرزەکارانەوە ڕێژەی دەست نیشان کردنمان لێ دەبێتە کارێکی بێ پایانو دەست بۆ بەردەوامی نەگۆڕان ڕادەکێشین .. بەلام هەر کە شنەی شەماڵێکی بە ئارامبوو لە ڕووخسارمان ئـەدا دێینەوە سەر خۆو دان بەوەدا ئەنێین کە لە هیچ بـەرهەمێکی ئـەدەبیدا کۆتـایی بۆ جـوانیو لوتکەی جـوانی نییە .. تـا داهێنەر لە شیعرا هەوڵی ناوەندی بە هێزو بابەتی بەتام بدات .. (چاوەڕوانی بێهودە) خۆری بەڵگەی ئەم ڕاستییـە لە کەڵ هەستی (هەردی) یەوە بەدەر دەخاو نیشانێکی ڕاستەقینەی

گۆڕانکاری چوونە پێشەوەیە لە مەیدانی ئەدەب و شیعری ڕەسەنی کوردیماندا :

**شنەی (با) باسی جوانی ئەو بە گوێی مندا ئەچرپێنێ**
**هەموو دەرکەوتنی شۆخێ دڵی من دا ئەخورپێنێ**

**بەڵام خورپەی تەواوی دڵ لە گەڵ هەنگاوی ئەودایە**
**کە سەرتاپا لە ئاوازی بەهەشتی خواوە پەیدایە**

پەیوەندی بناغەیی لە نێوان (ئاین)و شیعرا بایەخ دەدات بایەخ بوونێکی گەورە بە (گیان)و بەهرەو لێکدانیان لە بنەماکانی هەستدا .. ئەم گیانی‌یەش ئەشێ کە ڕێچکەیەکی تایبەت و جیاوازبێ لە یەکێ لە لایەنە جیاوازەکانی بۆچوون و لێکدانەوەی ووردی شاعیردا ، کە لە پاڵ نەریت و کاری کۆمەڵایەتی‌دا ئەدرکێنرێ .. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بۆ چوونی مرۆڤ لە بارەی دیاردە نهێنی‌یەکانی سروشتەوە زیاتر کێشی ڕاستی ئەگرێ لە تای تەرازووی هەڵسەنگاندن و شاکاری مرۆڤانەدا ..

ئەو (شۆڕشە گیانی) یەی (هەردی) لە شیعری (ئەی دیدە پەری) دا بە دەستی هێناوە .. ئامرازێکی خواکردانەی بە هێزە کە شاری جوانی لە خۆبایی‌بوو لە ژێر کاری بێ‌هاوتایی سروشتا ئەنجامێکی ئەوتۆی بۆ دەست نیشان‌کردووە کە ئەو جوانی ڕووخسارو شۆخی‌یە لەو شێوە تایبەتەدا گەرد بە گەرد شی‌کردۆتەوەو پیربوون و هەڵوەراندنیشی وەك ڕێبازێ ئاراستە کردووە ...

بەڵام ئایا ئەم دوو بڕوا تەریبی‌یەو لێك نەدانیان لە خاڵێکی بنەڕەتی ناوەخنی شیعرەکەدا ئەبێ لەوەوەبێ کە (هەردی) وەك ڕەمز بڕوای بە کۆتایی ژیان و جوانی ژیان هەبێ یان ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆیە کە لە سەرچاوەی ڕاستی و بوونە خوا کردی‌یەکەوەیە .. ؟ ئەمە بەڵگەیەکی تەواو تەواوی بیری شاعیرە کە هەموو شت لە دنیادا ڕێژەیەو تەنیا بوونێ نەبێ کە دروستکەرو هۆی گەشە پێدانی ئەو جوانی‌یەیە ..

بەڵێ لەسەرەتاوە گەلێ لەم بابەتە شیعری یانەمان لە گوڵزاری شیعری کوردی‌دا هەیەو بە بەرچاوەوەن کە تیایدا مەبەست لە دوانێکی کۆڵینەوانەیە لە نێوان بوون و نەبوونا لە خولگەی ناوەڕۆکی شیعری‌دا .. وەنەبێ (هەردی) وەك لاسایی‌کردنەوە دووبارە کەرەوەی ئەم ڕێچکە شیعری‌یەبێ بەڵکو بە پێچەوانەوە نوێ بوونەوەیەکی ئەوتۆی تیا بەدی ئەکرێ بگرە شۆڕشێکی گیانی‌ی تەواوە بۆ گۆڕان لە بنەڕەتی ئەو چینەدا کە هەموو شت لایان نەگۆڕەو وائەزانن ژیان هەروا بە سادەیی و شۆخی وەك بەهارە خەو لە بەردەستایەو بێ پایان دوورە لە پایزی پیری و گەڵاڕێزانی ڕووخساری تەمەن :

**ئەی دیدەپەری بەو دەمە ، بەو کوڵمە گوڵینە**
**بۆ کەس نی‌یە تاسەر ، ئەوەرێ ئەم گوڵی ژینە**
**تاسەر نی‌یە ئەم نازە ، وەها دووری مەبینە.**
**ئەو چاوە کەلاوێژە ، خەڵاتی کە برینە ...**
**ئەو زوڵفە کە ئێستاکە دوو توێی عەنبەری چینە**
**ڕۆژێکی کە دێ تێکەڵی تـوێی خاکی زەمنیە**

**ئەو گەردنە بێگەردە ، کە وەك تەختی بلوورە**
**ئەو لێوە کە وەك خونچە تەڕو ناسك و سوورە**
**ئێستاکە بەبێ ڕەحمی سزای جەورو فتوورە**
**لای وایە کە ژین فانی نی‌یەو ڕێگەیە دوورە**
**نایزانی کە هەر پەنجەیە لەم خاکی زەمنیە**
**کوڵی دە هەزار (لەیل) و دەمی سەد (مەم و زینە)**

لەو بڕوایەدام ڕۆشنبیری و شاعیرێتی (هەردی) بگەڕێتەوە بۆ ئەو جۆش دان و مەستبوونە لە بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەی شەپۆلەکانی دەریای دەروونی .. ئەویش بەواتا دەربڕینی سەرەکی لە مەبەست و ئەو چێژەی کە لەو بێزاری‌یە کوشندەیەو هیوای چاوەڕوان کراوەوە وەری گرتووە ، ئەمیش چەشنە قووڵبوونەوەیەکی ئەوتۆی تیایە ئەگەر لە ئاسۆی شیعری‌یەوە سەرنجی لێ بدرێ دەستکەوتێکی هەستی‌ی گەورەو بەخشندەییەکی پڕ بەسۆزی مرۆڤانەیە ...

(ڕازی تەنیایی) ئەگەرچی بە بەرهەمێکی هەڵقوڵاو لە بنەوانی ڕۆژگارێکی پڕ لە سەختی و تارمایی نائومێدی دەدرێتە قەڵەم بەڵام لە هەمان کاتیشدا جم و جوڵێکی بێ سرەوت و گەڕانێکی بێ ووچانە بە دوای ئەو ماددە خامەی کە (هەردی) ئەیەوێ لە گەڵیا یەك بگرێ بۆ تەواوکردنی ئەو هاوکێشەیە کە لە ئاسودەیی ژیان و تیشکی بەختەوەری یا ئاوێتە بووە :

**شەوی تەنیایی ، ڕوونـاکی چـرای ئـاواتی خنکـانم**
**دەسی نـاکـامی ئـاوازی دەروونی کـەیـلی ، تـاسـانم**
**ئەوا ئێستا لەگەل زامی**
**دەروونی پڕ لە ناکامی**
**ئەپێوم چۆلی سەرسامی**

خۆ خواردنەوەو سوور بوونەوەی ژیلەمۆی دامرکـاوی ئـاهی گەرم .. وێنـەی وورووژکانـدنی لێکدانـەوەو شەکـەتی تـەنیایی‌یـەکە بێ ئـارام بیرەوەری‌یـەکی تاڵ لە ڕۆژمێـری تەمەندا تۆمار ئەکات .. جا ئەگەر هاتوو ئەم گەوهەری هەوێنە خرایە قاڵبێکی هۆنینەوە لە ژێر کاری بەهـرەیەکی ڕەسـەن‌و دەربڕینێکی بە باڵای چێژی شیعری .. ئەوا بـەرهەمی ئـەم هەموو وێنانە بەرهەمێکی تەواو پێگەیشتووی ڕاستی ئەوکاتەیە کە کۆرپەی ئەم شیعرەی تیا لە دایک ئەبێ ..

کەوابوو ئەو هەموو وێنە ڕەش‌بینی‌یانەی کە لە (ڕازی تەنیایی)دا بەرچاو دەکەوێ خۆ بەستنەوەیەکی شاعیرانەیە بە یاسای ڕاستگۆیی‌و پەیڕەو کردنی ئەو سروشت‌و ناوو هەوایەی کە (هەردی) بە زنجیرە پڕ لە کسپەو سزا نا ئومێدی‌یـەکەیـا تێ پەڕبووە .. شاعیر بلیمەتێکی کۆمەلایەتی‌یە ئەوی دەی بینێ لە بەدکردەوەیی کرداری نادروست‌و شاکارە مەزنەکانی کۆمەل وەك ئـاوێنەیـەکی بێ‌گەرد ئـەیداتـەوە ئەگـەرچی ئەو کـارە نادروست‌و شـاـارە (کەسی) بێ یان (کۆمەلێ) .. بۆیە (هەردی) نەی توانیوە درۆ لە گومانی‌یا بگونجێنێ‌و نەگونجاندنی بڕوای بەو ڕۆژگارە بە هەنگاوێکی دروست لە ناوەوەی شیعـرەکەدا بکات بە هەلوێست‌و نێتی شیعری لێ بێنێ :

**ئـەگێـرم چـاوی بێ‌تینم لە تـاریکی شـەوا سـەرسـام**
**نی‌یـە پـرشنگی دوو چـاوێ کـە ڕوونـاکی بکـا ، ڕێگـام**
**بەغەیری باڵی غەمناکێ**
**شەوی پڕ ترس‌و سامناکێ**
**نی‌یە یەك تۆزە ڕوونـاکێ**

ڕاستیەکی تریش کە وەك خۆری پـرشنگدار نیشـانەی یـەك ڕوویی‌و یەك باری‌یە لە زمانی لێ دوان‌و خەملاندنی شیعری (هەردی)دا گەڕان‌و خۆ ماندووکردنە بە دوای ترووسکەیەكدا شەبەقێ بخاتە شووشەی دەیجووری ئەو شـەوگارە ئـاڵۆزو سامناکەوە کە جگە لە هەنـاسە تـەنگی نائـومێدی‌و ئـاوازی گـریانـاوی هیچ جـۆرە بەستـەیـەکی ئـاوات‌و ئـاهـەنگێکی بەختەوەری تیا نابیژێ ...

ئەوەتا لە شیعری (نا ئومێدی)دا دەرگای ئازارێکی پڕ لە چەرمەسەرێی بە کلیلی ژانێکی خەست‌و قوول دەکاتەوەو پەل دەهاوێ بۆ هەموو کەلێن‌و قوژبنێکی ویژدانی‌و بەر پرسیاری مرۆڤانـە بۆ ئـەوەی لیستەی تـۆمارکـراوی ئەو ژیـانە پـڕ لە ڕەنجەڕۆیی‌و پەشێوی‌یە لە گەل زامە بەسۆکانی تری تەمەنیا بە یەك شێـوە لە ڕەنگ‌و دەنگـا بە دیمـەنێکی تری شیعـری دەربڕێ :

**تـروسکەی تیـا بەدی نـاکەم سـەرنجم چـەنـدە لێ داوە**
**لە تـاپـۆی نـامـورادیم‌و تـەمی نـاسـۆری بـەولاوە**
**ئـەوەی یەك تـۆزە ڕوونـاکی ئـەدا بـەم ژینـە شێـواوە**
**دڵێکی پـڕ لە ئاهـەنگ‌بـوو ، کە ئێستـا پـاکی ڕووخـاوە**

لایـەنـی مـرۆڤـایـەتی‌و خـستـنـە ڕووی کێـشـە مرۆڤایەتی‌یەکان لە بەگژ یەکـا چوون‌و هـەڵسان‌و داچـوونی کۆمەلایەتی‌دا بنچینەی شیعری پتەو دەکات .. بگرە بابەتێکی ماددی پێگەیشتووی هەڵگۆڕانەیە کە شان بەشانی پێشکەوتنی بەرهەم هێنـەر لە ئامێـزی بیری پێشکـەوتن خوازانـەدا چاو هـەڵئەهێنێ بـەدنیای شـارستانیـەت‌و وورد‌ەکاری چـوونـە پێشەوانەدا ...

(دڵداری کچی تازە) نموونەیەکی ڕاستەقینەو زیندووی بـەجێی ئەوسـاو ئێستای کـۆمەلایـەتیمانـە کە تیـایدا وەك فـێرکارێـك وانەی فـێربوونی ڕەخنـەگرانـەمـان دائـەدات لە قوتابخـانەی کـۆمەلەوە .. نـەخۆشیـەکانی کـۆمەل هـەر لە خۆپەرستی‌و ڕازی‌بوون لە خۆو خۆهەلقورتاندن لە کاری دوور لە ووزەی کەسی‌و مل کەچ‌کردن بۆ ویستەمـەنی تایبـەتی .. هتد ، شی‌کردنەوەیان زاڵبـوون بە سـەر ڕێگەی نـەهێشتنی

پتربوونیانە کارێکی شیاوو دروستی ئەم چەرخە تازەیەی ئێستامانە ...

(هەردی) لە (دڵداری کچی تازە)دا نوێ بوونەوەیەکی بووختی هاوچەرخانەی لە بەهرەی هەستییەوە هێناوەتە بوون .. کە تا ئێستاش بابەتیوا لە زەوی بە پێتی دەروونی کەم شاعیردا چەکەرەی کردووە : بەم جۆرە (هەردی) ئەو تەم ومژە لە بیری کۆنە پەرستانەی هەندێ کەسدا بە بڵێسەی هەنگاوێکی پێشکەوتووانە ئەرەوێنێتەوەو ئەو برینە بەدەرمانێکی کسپە بڕی دانەرانە سارێژ ئەکات .. نرخدان بە ڕەها بوونی ئافرەت لە بۆتەی قاڵ بوونەوەو بەشدارکردنیان لە بەرهەم هێنانو سڕینەوەی لاپەڕە ڕەشەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا خاڵی دەستپێکردنی نوێ خوازانەی (هەردی) یە :

**باخەوان بۆ ئەو مەبەستە گوڵ ئەلاوێنێتەوە**
**بۆ ئەوەی گەورەی بکاو بۆ پارە بیگوێزێتەوە**
**بیفرۆشێ بەو کەسەی خەڵکی ئەڕوتێنێتەوە**
**بۆ ئەوەی مێزی شەرابی پێ بڕازێنێتەوە**
**کچ لەلای ئێمە گوڵێکە بۆیە پەروەردەی ئەکەن**
**تا بڕازێنێتەوە مێزی شەرابی دەوڵەمەن**

(هەردی) لە لووتکەی ڕۆمانسەوە بە پەرەمووچی سۆز شێوازێکی (میلۆدی) مۆسیقایی تێکەڵ بە (کەتەنزە)ی ئەندێشەو بێسنووری هەست لە (تانگۆی کوردی)دا دێنێتە ئاراوە ، هەر لە خوێندنەوەی نیوە دێری یەکەمی پارچە شیعرەکەوە هەتا کۆتایی خوێنەر خۆی بە پاڵەوانی ڕاستەقینەی ئەم ڕازە شیعرییە ئەزانێ ..

ئەوەی جێی سەرسوڕمان بێ لە (هەردێ)و شیعری (هەردی)دا ئەو خشڵو ڕازاندنەوەیەیە لە ووشەی شیعری ناسک کە بە باڵای بووکی هەستی یا ئەپۆشێ .. هەروەها ئەو دەست پێکردنو ئەنجامە بە توانایەیە کە لە بەرهەمەکانیدا بەرچاو ئەکەوێ سەرەڕای ئەوەی کە بەرهەمی شیعری کەمە توانیویتی بەم چەند شیعرە گۆشەیەکی تایبەت بۆ خۆی بگرێ لە دڵی ئەدەبی کوردیدا وە ئەگەر ئەمە نەبوایە بە پێچەوانەوە ئەم بەرهەمە کەمە ئەبوو لە ژێر تەپو تۆزی کەمتەرخەمیو لە بیربردنەوەی (هەردی) خۆیدا بفەوتایە .. ئەوەی دەیڵێم لە (تانگۆی کوردی)دا هەن کە تابلۆیەکی شیعری ڕۆمانسانەی زیندووە :

**با لە دەستی ژینی پەستی ، شارو دێ**
**ڕابکەینو ڕوو بکەینە چۆڵو هەردێ**
**تەنیا وەك ئاسکۆڵەی کۆسار**
**لە قەد پاڵی شاخی هەزار بە هەزار**
**لە سای سێبەری درەختی ناو گوڵزار**
**کونجێ بکەین بە هێلانەو هەوار**
**دەست لە گەردن ، تاکو مردن**
**شۆخو شاد**
**خەمی دنیا بە ماچ بدەین**
**بە باد**
**گۆنات هەڵزم پڕ بە دەم**
**سوور هەڵگەڕێ هێندە ماچت کەم**

ئەگەر مەلی نوێ کردنەوەی شیعری کوردی باڵی ڕاستی (گۆران) بێت ئەوە بێگومان پێشەوای نوێ کردنەوەی باڵی چەپی (هەردی)یە .. ئەگەرچی لە چاو بەرهەم زۆریدا شوێنی ڕەخنەو جێگەی داخی ئەدیبو خوێنەرانە کە ئەو بەرهەمانەی لە (ڕازی تەنیایی) دا هەن لە چاو بەهرەو شارەزایی شیعریو هەستی بە سۆزی (هەردی)دا کەمەو هێشتا نەیان توانیوە کوڵی ناخو جۆشی دەروونی دەربڕن ..

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (هەردی) کە ڕەسەیەکی بوختو داهێنەرێکی هەڵکەوتووی نوێ کردنەوەی شیعری کوردیمانە چ لە ناوەرۆکی ڕێبازی ڕۆمانسییانەو چ لە سیمای شیعریدا کە بە فەرهەنگێکی بەکارهێنانی ووشەی کوردی ڕەسەن دائەنرێ ..

تێبینی

- (ڕازی تەنیایی) ناونیشانی پارچە شیعرێکی (هەردی)یە کە ناملیکە شیعرییەکەی بە ناوەوە ناو ناوە .
- میلۆدی : شەپۆلێکە لە شەپۆلەکانی دەنگ .
- کە تەنزە : شێوازێکی دابەشکردنی مۆسیقایە .

# بەڵێ: با سوارە باشتر بناسین

لە گۆڤاری هێژای «کاروان»ی خۆشەویست کە کاروانچیە دڵسووتاوەکەمان بە دیاری بۆی هێنام، بەرێزێک بەناوی «نیازی» سەبارەت بە «سوارە باشتر بناسین» لەبابەت ئەو هونەرە هونەرمەندە ناکامەوە نووسیبووی‌و هەڵبەستی «تۆ دەریامی» بڵاوکردبووەوە.

لەوەی کە ئەو باسە خۆش‌و شیرین‌و پڕ بایەخە کەوتووەتە ناو کۆڕی زاناو شاعیرو نووسەرانی دڵسۆز جێگای پێخۆش بوونەو هەڵدەگرێ تا ئەو جێگەیەی لەتوانادا هەیە لەسەری بنووسرێت، بەڵام بەو مەرجەی خوێنەر هەڵوەدای ئەم لاو ئەولا نەکەن..

وەك بەرێز «نیازی» لە لاپەرە «28»دا دەنووسێ «مامۆستا ئەسعەد نەقشبەندی» لە لاپەرەی «59» دا وای دەرخستووە کە گوایە کاتی خۆی شیعری «قەل‌و هەڵۆ»ی بۆخۆی داناوەو دەشێ لە قەل‌و هەڵۆکەی پوشکین بەتام‌و بۆن‌ترە..

خوێنەری کاروان بۆ پەیدا کردنی هەڵبەستی «پیرە هەڵۆ» نەك قەل‌و هەڵۆ دەکەوێتە پرسیارو ڕەنگە چنگی نەکەوێ، لە لایەکی دیکەوە کە سێکی وەك مامۆستا ئەسعەد نەقشبەندی نووسیویەتی کە ئەو شیعرە لە شیعرە رووسیەکەی پوشکین بەتام‌و بۆن‌ترەو خوێنەری کورد حەز دەکا ئەو پارچە گەوهەرە بخوێنێتەوە.

بۆ شارەزاکردنی خوێنەرانی کاروان بە پێویستم زانی بەش بەحاڵی خۆم ئەوەندەی لە باسی «پیرە هەڵۆ» دەزانم بینووسم، سەرەتای هاتنە کایەی «پیرە هەڵۆ» بەم شێوە بوو کە «دوکتور فانلری» ئەو شیعرەی پوشکینی لە رووسی یەوە وەرگێراو بە زمانی فارسی لەچوار چیوەی شیعرێکی جوان‌و رازاوەو پڕ ناوەڕۆك لە گۆڤاری «خووشە»دا بڵاوی کردەوە کە فارسی زمانان‌و فارسی زانان زۆریان پەسەن کرد.

لەو سەردەمەدا شاعیرێکی کوردستانی ئێران لە عیراقدا دەبێ‌و ناسراوێکی ئەدیبی دەبینێ، لە بەینی قسەو باسی وولاتدا ئەو باسەی بۆ دەگێڕێتەوەو چەن شیعریشی کە لەبەر دەبێ بۆی دەخوێنێتەوەو ئەویش زۆری پێخۆش دەبێ‌و لەژێر سەردێری «هەڵۆ هەر بەرزە» دەیکا بە کوردی، دوای ماوەیەك شاعیری جوانەمەرگ سوارەی ئیلخانی زادەش بەرەوپیری «هەڵۆ هەر بەرزە» دەچێ‌و بەناوی «پیرە هەڵۆ» شیعرە شاکارەکەی دەنەخشێنێ..

بۆ ئەوەی خوێنەرانی «کاروان» تووشی سەرەگێژە نەبن وا هۆنراوەی «پیرە هەڵۆ»ی سوارەی ئیلخانی‌زادە بە دیاری پێشکەشی خوێنەرانی بەرێزو وێژە دۆستی کوردی دەکەم، کە ئەمەش دەقی هۆنراوەکەیە..

**لەسەرسنوورەوە**
**عبدالقادر دەباغی**

# پیرەهەڵۆ

● سوارەی ئیلخانی‌زادە ●

پایزە دارو دەوەن بێ‌بەرگە
دڵ پەشۆکاوی خەیاڵی مەرگە

هەر گەڵایە کە لە داریٚ دەوەریٚ
نووسراویٚکە بە ناخۆش خەوەریٚ
تاو هەناوی نیە وا مات و پەشێو
لەشی زاماری دەکێشێتە نشێو
ڕۆژ پەرە ساردە کزەی بای زریان
کاتە بۆ ژینی لەدەسچوو گریان
دڵی پڕبوو لە پەژارەو لە دڵسۆ
ژینی خۆی هاتەوە بیر «پیرە هەڵۆ»[1]

بە قسە خۆشە مەترسی مردن
تاڵە ئەو هەستی بەمردن کردن
کاتی کۆچکردنە وەختی سەفەرە
داخەکەم سەختی نەمانم لەبەرە
هەر بینا هات ئەجەل و من مردم
با، لە شیویٚ پەڕو باڵی بردم
تۆ بڵێی ئەو خەوە هەستانی بیٚ ؟
یانە ئەو قافڵە وەستانی بیٚ ؟
تۆ بڵێی پاشی نەمان ژینیٚ بیٚ ؟
بۆ لەشی ساردەوەبوو تینیٚ بیٚ ؟

مەرگە دێو دووا بە هەمووشت دێنیٚ
هەموو ئاواتیٚ لەدڵ دەستێنیٚ
شارەزای ڕیٚگەی مرن کیٚیە ؟
چیە ئەو مەنزڵە کوێنەی جیٚیە ؟
هەر بڕۆم نابەڵەدو بیٚ سەرو شوێن
دیار نیە خێڵی هەڵۆیان لەکوێن
پاشەڕۆکێکی بکەم لەو باخە
تاکوو باڵ و پەڕی من پەرداخە
نابمە ڕێبواری کەلی هات و نەهات
چارەکەم بەڵکوو ئەوا هات و نەهات

خۆی بەخۆی گوت کە دەچم بۆ لای قەل
کەیخوای پیرو بە بیری گەلی کەل
هەڵفڕی ڕاوکەری زاڵی کەژو کێو
لە چیای بەرزەوە ڕووی کردە نشێو
کەوتە ئەو دەشتە لەترسا تەق و ڕەو
دەرپەڕی کورکوڕو کڕ مایەوە کەو
هاتە لای قەل بە کزی و بیٚ وازی
قەل وتی مان هەڵۆ ناسازی
وتی قالاوە ڕەشەی پسپۆڕم
پیرم و پیٚیە لە لێوی گۆڕم .
باخی ژینم بە خەزان ژاکاوە
کاتی مەرگەو ئەجەلیش ناکاوە
هێزی ئەژنۆم نیە باڵ بیٚهێزە
هەموو گیانداریٚ ژیان پارێزە
پێم بڵیٚ چۆنە کەتۆ هەر لاوی
گەرچی زۆر پیری بەلاوی ماوی
قەل وتی باشە کە گوێ ڕادێری
پەندی من پاکی بەدڵ بسپێری
ئەو دەمەی بابی بەهەشتی من مرد
دوور لەتۆ دەردو بەلای ئێوەی برد
پیٚی وتم ڕۆڵە هەوای زارو ئەزار
هەیەتی دەردو نەخۆشی بەهەزار
تا ووزەی پیرۆ خەیاڵ سەردەکەوی[2]
کە لەگوڕ کەوتی وەها وەردەکەوی
دیق و زەردوویی و ئاهوو وەرهەم
بە گزەی بای بەقەوەت دێن بەرهەم
گۆشتی کەو چەندە کە تامدارە بەناو
هەگرو هالاوی دەهەنوێتە هەناو
پەین و پاڵیٚ کە لە پالی دێیە
مەنزڵی نوکەری خۆتی لێیە
کەرە تۆپیوو کەلاکی گوێلکە
هەڵمی دڵ ڕوونکەرەوەی سەر گوێلکە
پێکەوە چینە بکەین لەو پەینە
بۆی سەنێر مەڵهەمی بیرو زەینە
ورد بەوە چەندە بە مانا قوولە
مەسەلەو گفتی ، قەلی ماقوولە
بیکە سەرمەشقی ژیان ئەو نیشە
ـەر لەسەر داری ئەوی دانیشە

* * *

▶ هاتەوە بیری هەڵۆ ڕابوردووی
پاكی بووژاندەوە یادی مردووی
گوڵكرا ڕایەخ و پایەندازم
چەندە ئاژوا لەشی كێو ئاوازم
چەندە ڕوانیمە زەوی لەو بانە
كێوو دەشت لەو سەرەوە چەن جوانە
چەن چكۆڵەن پەلەوەر لەو بەرزە
ئاخ كەچەن خوێڕی گرە ئەم عەرزە
چەندە ڕاوی كەوو كەوبارم كرد
دوژمنی تاقمی شمقارم كرد
كۆلكە زێڕینە وەكوو تاقی زەفەر
عاسمان بۆمنی بەست كاتی سەفەر
حەوتەوانان بوو میدالی شەڕی من
چەندە شۆراوە بەخوێن شاپەڕی من
ئێستە بۆ وا ڕەبەن و داماوم
من هەڵۆ چاو لە دەمی قالاوم
ساكە ئەو كارە وەها ساكارە
مەرگە میوانی گەداو خوونكارە
هەوری عاسمان بێ خەڵاتم باشە
یا لەشم خاشە بكێشن واشە

* * *

گوتی وا ژینی درێژ پێشكەشی خۆت
گۆشتی مردارەوەبوو هەر بەشی خۆت
ژینی كورت و بە هەڵۆیی مردن
نەك پەنا بۆ قەلی ڕووڕەش بردن
لای هەڵۆی بەرزە فری بەرزە مژی
چۆن بژی شەرتە نەوەك چەندە بژی

* * *

١ ـ سەردێڕی شیعرەكە «پیرە هەڵۆ» یەو ناوی قەل لەسەردێڕی هیچكامیاندا نەهاتووە ، نازانم مامۆستا ئەسعەد نەقشبەندی چۆن بەقەل و هەڵۆ ناوی بردووە .

2 ـ لەبەر ئەوە ئەم هەڵبەستە هەر دەسنووسەو ڕەنگە برە شیعرێكی پاش و پێش كەوتبێ ، من بەم شێوە دەستم كەوتووە .

# ناوبژی برایی نیازی و

**ووتارەكەی «كاك (ئەسعەد نەقشبەندی)م نەدیوە ، بەڵام ووتارەكەی (نیازی)م خوێندەوە ...»**

سوارە ئێلخانی ، لە بنەماڵەی ئێلخانی ی شاری بۆكانە ، ئەم بنەماڵەیە خێوی زەوی و زارو دێ و گوندن لەو ناوەدا . شای ئێران كە زەوی و زاری لە ئاغاو دەرەبەگان وەرگرتەوە ئەوانیش كەم دەس بوون و ، دەسەڵاتیان نەما . باوكی سوارە سەرهەنگ بازنشتە (عەقید موتەقاعید) بوو ، ناویم لەبیر نیye وابزانم «عبداللە» بوو . سوارە سالی «1320»ی خۆری (1941ز) لە شاری سەقزی نەبەرد لە دایك بووە لەبەر دەستی باوەژنا گەورە بووە لە قوتابخانەی فەقێیان و میری خوێندوویە ، قوتابخانەی ناوەنجی دووا هێناوە ، كوردی فارسی ، توركی ، ئینگلیزی زۆر چاك وەزانی عەرەبیشی پیچەك دەزانی لە ئێران هەڵاتبووە عیراق و ماوەیێ بە كوردستانا گەڕابوو ، هەندێكیش لە ژوورەوە بووبوو ، پاشان كە گەڕابووە ئێران بەتاوانی (كۆمۆنیست) چەند ساڵێ خرابووە زیندان ، وەبەر لێبوردن كەوتبوو ، پاشان بە لامژی و پینەو پەڕۆ خۆی كردبووبە قوتابی حقوق و هەر بەو جۆرە تەواوی كردبوو .

سوارە لە پەخشان نووسیندا بێهاوتابوو ، بیری لەووشەو ڕستە نەدەكردەوە ، هەم بەكوردی و هەم بەفارسی بلیمەتبوو ، بەلام ئەسپی خامەو پێنووسی مەیدانی

نووسینی : ئاشنا

# لە نێوانی سان نەقشبەندیدا

خۆبەردانی بۆ چوڵ نەبوو بوو ، کە بتوانێ خۆتاقی بکاتەوەو خەڵق بەقامك دییاردی بۆبکەن ، لە هۆنینەوەی شێلاوکەی دڵو دەرونی پڕ سوزیشا ، بەراستی هەستیارو هەڵبەستیارو هونەری چاكبوو ، لەمەدا تۆزێك ناوی خۆی بیستبووەوە چونکە زۆر کەس پارچە هەڵبەستو هۆنراوەی ئەویان لەبەر کردبوو ، نیشتمانیێ یادلداری ...

ساڵی (1346 خۆری = 1967ز) جەنابی (مامۆستا موعتەمەد وەزیری) خەڵقی سنەبوو بە وەکیلی وەزارەتی ئیطیلاعات لە تاران ، لەم کاتەشا سەرۆکی رادیۆی کوردی «شێخ عابیدی سیراجەالدینی» برا گەورەی ئەم ئەسعەد نەقشبەندییە بوو ، پیاوێکی پیاوانە بەئەدەب ، خۆشخوو ، بەشەرم تابڵێی ناسكو رەوشت جوانبوو ، لەگەڵ وەکیلی وەزیر بۆرە خزمایەتیەکیان هەبوو ، خانم (پەروین موشیر وەزیری) ژنی ئەسعەد وەك بزانم ئامۆزای بوو ، (پەروین ئەمرۆ لە عیراقدا گۆیەندەی فارسیو کوردیٚ رادیۆیە) شێخ عابید کالێجی ئیلاهیاتی (کوللیەی شەریعە)ی تەواو کردبوو ، خەریکی دەورەی دیکتۆرابوو ..

سوارە ئەیویست لەم هەلە سوود وەربگرێ ، هاتە رایۆو داوای کاریکرد ، شێخ عابید کە لەگەڵ وەکیلی وەزیر قسەی کردبوو ، رێی نەدابوو ، ووتبووی کۆنەسوورە ... مەلا جەمیلی رۆژبەیانی کە لەوەبەر سوارەی ناسیبوو چووە سەر وەکیل وەزیرو تێی گەیاند کە سوورنی یەو ، کوردێکی کوردی چەپی یەو ، لە تاوانی کۆمۆنیستی دوورە بەم جۆرە لە رادیۆ دامەزرێنراو ، بەرلەوەی دەس بەکاربێت ، شێخ عابید بوو بە ئەندامی (مەجلیسی وەطەنی)و لە جیٚ ئەو «مەظهەری خالیقی» دەنگ خۆشی گۆرانی بێژ ، کە دەرهاتووی کۆلیجی فیزیا - کیمیابوو ، وەهیچ پەیوەندیییکی لەگەڵ ئەدەبو نووسینی کوردی نەبووە ، لەجێی شێخ عابید دانرا ، یەك دوو مانگێ خالیقی بوو بە خزمەتکاری خۆڵی بەرپێی نووسەران تا جێی خۆی گرتو ، لەم کاتەدا رادیۆ لە وەزارەتی ئیطلاعات (ئیرشاد) جیابووەوە ، بوو بە سازمانێکی سەربەخۆ بە سەرۆکایەتی (موهەندیس قوطبی - کە ئێستە لە دەس خومەینی رایکردووەو دژیتی) یارمەتی دەری ، ئەو نووسەری گەورە (جەعفەریان) بوو - هەزار رەحمەت لە گۆڕی - ئەویش خومەینی ناجسن ئیعدامی کرد خوا بە ئیعدامی بدات : -

کارمەندانی رادیۆ کە هەریەکە (500 — 1500) تمەن موچەیان بوو ، بۆیان کرا بە (1500 — 3000 — 4500)و بووژانەوە .

بڕیاردرا ، رۆژبەیانی ووتارێکی (مێژوویی - وولاتناسی) بنووسێت بەناوی (وولاتەکەت بناسە) سوارەش ووتارێکی ئەدەبی بنووسێتو ناوی نابوو (تاپوو بوو مەلیل)و زۆر کەس داوای ئەوەیان ئەکرد مەبەست لەم ناوە روون بکرێتەوە ، بەلام رۆژبەیانی لەگەڵ سوارەدا کردبوویانە (شەبەحی بەیان) - کەچی مەبەست دەسەلاتی ناهەمواری تاپو ئاسای وولاتی تاریکي لیل) بوو هەرچەنە بڕیار وەهابوو کە بەرنامەکان بە کۆمەلی بخوێندرێتەوەو ، رای لەسەر بدرێ ، بەلام رۆژبەیانی بەدزی یەوە بەرنامەکەی سوارەی ئەخوێندەوەو ، ئیمزای ئەکرد ئینجا برادەرانی تری ئەیانبینی .

جارێکیان سوارە بەرنامەکەی بە پارچە هەڵبەستێ دووا دێنی کە (شاە) ئەکاتە (داوڵ) - واتە ئەو پەڕۆیەی ئەبەسترێ بەداریکەوەو لە ناو باغچەو دەغڵو بێستاندا دائەنرێ کە مەلویچكو پەرەندە لێی بترسن ، رۆژبەیانی بەدزی یەوە ئەیخوێنێتەوەو بە سوارە ئەلێ (... چویل ! ئەتەوێ ببی بە ... دێزە بۆ تۆپینی خۆتو زەرەری خێوت) ئەویش لە وەراما ئەلێ : (... زلەی حەمە بلە ! منو تۆ لەژیانا بێزارین لەسەر شتی وەها تیا بچین باشترە) ئینجا ئەدەنە قاقای پێکەنینو هەڵبەستەکە

ئەسرینەوەو ئەو دووای نووسەران پێی نازانن ..

«مەظهەری خالیقی» تا بڵێی گەنجێکی جوان ، دەنگ خۆش ، لەڕووا شەرمن بوو ، بەلام بەداخەوە پیاوێکی نهێنبڕو کەم فرصەت و بێ کەڵك ، دوژمن بەکورد ، بەدرەفتار ، ڕاپۆرت نووس بوو ... لەسەر ئەم خوانەی گوێزرایەوە بۆ کرمانشاە ، بەلام کێ هاتەجێی ؟ کابرایێکی زۆڵە کوردی نەخوێندەواری خۆپەسەند ؟ ناومان نا (.... دێزە) لەم دەورەدا (عەبدوللا مەردۆخ) دامەزرا ، فارس زان ، کوردی نووس ، خەت خۆش ، هەستیار ، نێسك سووك ، گاڵتەچی ، ئینجا سێ قۆڵی کۆڕی گاڵتەو قەشمەری بەکەردوون دەسی پێکرد : (مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی) سوارە ناوی نابوو ، سوارەش ناوی (... چوێل) بوو عەبە مەردۆخیش (.... گەڕ) چونکە بچکۆلەو لەڕبوو ، ئەوانی تری ناوی پڕ بەپێستی - خۆیان هەبوو .

ئەسعەد نەقشبەندی و پەروین خانمی خێزانی کە دەوری گوێەندەیی و چیرۆك نووسی یان ئەگێڕاو بەرنامەکانی ڕۆژبەیانی و سوارەیان لە خۆیان چاتر ئەخوێندەوە ، گوێزرانەوە بۆ ڕادیۆی (سنە) ، کە شێخ عابید پاش هەووا هاتنی ئەندامێتی مەجلیسی وەطەنی بوو بووە (مدیر عامی ئەوێ) ... شێخ ئەسعەد نەقشبەندی لەم دەورە بەدوواوە ، ئیتر پەیوەندی یەکی وەهای بەسوارەوە نەمابوو کە هیچی دەربارە بزانی ، تکایە (کاك نیازی) ئیتر لە هەڵەکانی ببووریێ ئەو ، هەڵبەستەکانی «تۆ دەریامی» وە (قەل و هەڵۆی) لە دۆستەکانی وەرگرتووە .. سوارە ، وەك ووتمان لەسەرەتادا لەبەر دەستی باوەژن گەورە بوو بوو ، پاش ژن خواستن بەجۆرێکی دەس تەنگانە ئەژیا کە هاتە ڕادیۆ بە (600) تومان دامەزرا هەر چەند بۆ ئێران باش بوو بەلام بۆ ئەو کەم بوو ، چونکە ئەو یەکجار دەس بڵاو بوو ، هیچ کاتێ فلسێکی (ریاڵێکی) لە گیرفان دا نەبوو ، بانکی ئەو مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی بوو قەرزی لێ وەرئەگرت وەئەیخستە بەرزەکات ، سوارە ژنێکی هەبوو تورکمانی ئازەربایجانی بوو لە ماڵیان کلفەت (کارەکەر) بوو .

بەبێ رەضای باوکی و هەموو بنەماڵەی ئێلخانی خواستبووی هەقیشی بوو ژنەکە حەزی لێکردبوو زۆریش جوان بوو ، لەم ژنە کوڕێکی هەبوو ، سوارە هەرکە مووچەکەی بوو بە (3000) تومان بەدزی یەوە کچێکی پەرستاری (نەخۆشەوان)ی خواستبوو ، زۆریش خۆشی ئەویست ، بەلام هەزاریەکی ژنەکەی خۆی جوان نەبوو ... جارێکی تری سوارە کەوتەوە دەس تەنگی (گوریس یەك لانە نەدەگەییشت ئەیانکرد بەدوولانە) .. کچە پاش بەینێ کەوتە هەوەسی (ئەمەریکا) سوارەی خەڵەتاند بەوەی لە ئەمەریکا بە دوکتۆر دەرئەچێ و سوارەش ئەباتە ئەوێ .

کچە چووە سوارە نیوەی مووچەکەی ئەدا بەهەقی تەلیفۆندا کە لەگەڵ ئەو قسەی دەکرد ، سوارە دەردی هیجران کاری تێکرد ، پارچە هەڵبەستی (تۆ دەریامی) لەم حەلەدا ووتووە ، کچە پارەی ئەویست و سوارە نەیبوو ڕۆژبەیانی ناچار ئەبوو کاغەز بنووسێت بۆ جەعفەریان - رەحمەت لە گۆڕی و ، بەلا لە خومەینی) داوای یارمەتی بۆ سوارە بکات جارێکیان (20 هەزار تومەنی کە دەکاتە (1000 دیناری) دایێ ووتی ئیتر بەسە .

زستانی سالی 1354 خۆری (1976 — 1977 زا) زۆر سەخت بوو سەر زەوی تاران دوو مانگەی (دەی بەهمەن) واتا کانوونی یەکەم و دووەم) بەتەواوی مەیی بوو ، سازمانی ڕادیۆ تەلەویزیون لەسەر گردێکی هەرە بەرز بوو ، ڕێگەکەی تووش بوو ، بەشی کوردی لای ڕاستی شەقامی پەهلەوی لەسەر شەقامی (جوردون) بوو کە بەناوی کابرایێکی ئەمەریکی مامۆستاوە ناونرابوو ، سازمان لای چەپەوەبوو ئەگەر لە تارانەوە بهاتایەی ، لە شمیرانەوە پێچەوانەبوو .

سوارە رۆژی 27/ دەی 1354 (16 کانوونی دووەمی 1977 زا) بەئوتومبیلی دۆستێ سەر ئەکەوێ بۆ مووچەی مانگانەو ، لای بانکەکە دائەبەزێ کە نیوەی ڕێیە ، پاش مووچە وەرگرتن لە بانك دەرئەچێ ئەیەوێ بە پشتیوانی (گۆچانەکەی دەستی) خۆی بگەیێنێتە سەر شەقامە قیرەکە - تەنها دە شەقاو لێی دوورە - بەلام لاقە شەلەکەی ئەخزێ و ئەکەوێ و بەندی دڵی ئەپچڕێ ، دۆستان ئەگەنە فریای وەئەیبەنە نەخۆشخانە (میثاقیە) - کەهی رادیۆ بوو .

پاش ساتێ ئامۆزاییکی و خانمی و مەلاجەمیلی ڕۆژبەیانی ئەگەنە سەر سەری ، دوکتۆرەکە بە دزی بە ڕۆژبەیانی ئەڵێت : (سوارە چەنسالێ لەمەو بەر نەخۆشی ناوزگی هەبوو ، زالۆی (زراو)ی گەنیبوو من زراویم فڕێدا ڕەگی زراویم بەست بەیەکەوە ، ئیستە ڕەگی زراوەکە پچڕاوەو ، تووشی زەردوویی یەکی سەخت دەبێ جگەری دادەڕزێنی و چارەی

نی‌یە ، تەنیا یەك هەفتەی تر ئەژی ..)

لە گەڵ ئەوەشدا کە رۆژبەیانی لە ژیانی نائومێدبوو بوو بەدرێژایی رۆژ بەسەر سەریەوە رائەوەستاو گاڵتەی لەگەڵ ئەکرد تاجارێکیان کچە نەخۆشەوانێکی (پەرستار) ئەرمەنی دەرمـان‌و خواردنی بـۆ ئەهێنێ ، ئـەویش لەپاڵەوە ئـەنکێنێ رۆژبەیانی پێ‌ی ئەڵێت : «هەستە چوێلی کەن ئـەم پەری‌یـە عیسەوی‌یە بچیتە سەر هەرمردوییێ زیندووی ئەکاتەوە ، تـو ئـەنکێنی ؟» سوارە بـزە ئیەگـری‌و ئەڵێت (من .. رۆییـوە .. ماوە) ..

بەڵێ سوارە یەك هەفتە لە نەخۆشخانەکە مایەوە ، رۆژی ١/ بەهمەن/ 1354 خۆری (22 کانونی دووەم / 1977 زا) گیانی بە فریشتـەی میهری دڵسـۆز سپاردو ، مـامۆستـا (صەلاح ئێلخانی) ئامـۆزای‌و هەنـدێ لەخزمـەکانی تـەرمەکـەیان لە نەخۆشخانە دەرکردو بەرەو بۆکان خستیانە رێ ، دۆستـان‌و کارمەندانی رادیۆی کوردی تادەرەوەی شار بەرێ‌یـان کردو لەگـەڵی چوون تـابۆکـان‌و ، مووچـە خۆرانی رادیـۆی سنەو مەهابادو دۆستانی ئەدەب بەخوا بگای ئەبەدی‌یان سپارد ... زۆرکەس بەقسەو هەڵبەست سەر شێوەنیان بۆ هەڵدا یـەکێ لەوانەی گورجاو گورج بەکوردی ئەمەی خوێندەوە (شوکورولڵا بابان) مودیری گشتی ی رادیۆی سنەبوو :

سوارۆ ! ئەستێرەی گەشی عـاسمانی ئـەدەب بۆچی ئـاوابووی ؟
بـۆچ رێگای ژینت نیـوە چڵ مـاوە ؟ خۆتـو سلوا بـووی ؟ تـازە زاوابووی ؟
سوارەی ئێلخانی ! بەگزادەی موکری ! سـوار خاصی مـەیدان ؟ !
بۆچی واکلیای لە نێوەرێدا ؟ نیوەرێ‌ی ژیان ئەوەندە بێ‌تاوان !
ئـاخـوصـەت سالیتـر دایکی زەمـانـە جێت پـڕنـەکـاتـەوە ؟
قـەت بـڕوا نـاکـەم ، وەلام ئـەداتـەوە سـوێنـلائـەخـوات :
هـاوتـای سـوارە قـەت بـەدی نـایـێـنـم هـێـزم نـەمـاوە
بۆ مەرگ ئەم زانا فەلەك وای لێم کرد پشتم چەماوە جەرگم براوە .
فـەلەك ئـەمـەوێ ئـەتـۆش وەك مـن ئـەزۆك بـمـێـنـی
ئـەمـانـگـو ئـەخـۆر ئـەهیـچ ئـەستێـرە قـەت هـەڵ ئـەهێنی ،
هەمووی بمرێنی
ئـاخـر پێم بـڵێ بـۆچ سـوارەت کـوشت ؟؟ بـوویتـە ئـاژاوە !
جـگـە لەنـووسـین‌و هـونـراوەی جـوان چی‌کـرد ئـەو لاوە ؟
واخستە ئەو لاوە !!!
سـوارە ! هـەمـوو شـاعیـرو نـووسـەران ، سـوارە ڕۆیـانـە ،
کۆسیان کەوتووە شین‌و رۆیانە ، پەك بۆ تۆیانە سوارە ڕۆیانـە !!

مامۆستا رۆژبەیانی کە خۆی بەخاوەن پرسەو خەمباری ئەدایە قەڵەم ئەهیچی دەربارەی نووسی‌و نـەهیچی دەربارەی ووت .. بـەڵکـو پـاش مـردنی کـەوتـە هـەوڵی چـۆن ژیـانی خێزانەکەیا ، لەگەڵ ئەوەشدا کە سوارە خزمەتی تەنیا هەشت ساڵ بوو توانی نیوەی مانگانەکەی بۆخێزانەکەی جێ‌بـەجێ بـکات !

عەبدوڵلا مـەردوخ‌و پەدرام طەیفـوری لەژمارە (48)ی گۆڤاری ناوخۆی رادیۆدا (قاصـدك) دوو سەر شیـوەنی زۆر جوانیان بـەفارسی بـۆ نووسی ، من لێـرەدا هینەکـەی لەمەڕ (عەبدوڵلا مەردوخ) هەر لەسـەر هەمان سەنگ‌و کێش ئەگۆڕم بەکوردی‌و ئەیخەمە پێش چاوی خوێندەواران :

لەژێـر گـڵی تـەنـگدا ئـەی غـونـچـەیی رەعـنـا چـۆنـی ؟
بێ تـۆ ئێـمـە لە خـوێنـاویـن ، تـۆ بـەبێ ئێـمـە چـۆنـی ؟
ڕشتـەیی کـۆمـەڵەکـەی ئێـمـە بـەبێ تـۆ لێـك پـچـڕا ؟
ئێمـە کـە کـوێن ئـەمـە حـاڵـمانە ! تـۆ بـەتـەنها چـۆنی ؟
وام لەسـەر گـڵی گـۆڕت ! ئـەی نـووسـەرە بـەرزەکـە ! دوێنێ !
تـاجـی سـەر بـویـوو ئـێـسـتـە لەژێـر پـێـدای چـۆنـی ؟
بێ تـو لەسـەر ئـەم خـاکـە بـەرینـە جێـگـەم تـەنـگـە !
تـۆ کـە جێت ئـێـستـە لە ژێـر خـاکـا تـەنـگـە چـۆنـی ؟؟
خـواردنـم داخ‌و خـەمی تـۆیـە ؟ بشێ جـارجـارە خـەیـاڵت !
لێـم بـپـرسێ کـە لەگـەڵ داخ‌و خـەمـا چـۆنـی ؟
روونکـردە بیـابـانی هـات‌و نـەهـاتی لەم شـارە هـەڵاتی ؟
من کـە لە شـارام خـەفـەت خـانم تـۆ لەبیـابـانـا چـۆنی ؟؟
گەرچی تۆ ئـەی دڵ‌و گیانم ؟ بـەرتیری فیـراق کەوتیـو چووی ،
لەم گەرداوەیی ژینە بەروح سووکی دەرچووی ئێستەکە چۆنی ؟؟؟

* * *

بە هیوام کاك نیازی‌و کـاك ئەسعـەد نەقشبـەندی هـەردوو لایان ڕاستی‌یـان بۆ دەرکـەوێ ... با ئـەمەش یادێکی حەوت ساڵانەی مەرگی جوانەمەرگ سوارەبێ .

1984/7/27ز (ئامەرداد 1361 خۆری)

# ڕاڤەکرنا مەم و زینێ کارەکێ بساناهی نینە

**ڕەشید فندی**

د هژمارا 16 ێدا ، ژ گوڤارا « کاروان » یا خوشتڤی ، سەیدا « ئەمینێ ئوسمان » گوتارەك لسەر مەموزینا « خانی » بەلاڤکربوو ، و بو ڕاستکرنا هندە ڕێزێد شعرێ ژ مەمو زینێ خەبتیبوو ، و هتا پلەکێ ئەو ڕێز ڕاڤەکربوون ، کو ئەڤ کارە بخوێ پیروزو ژێهاتییە ، ژبەر هندێ کو ئەم دزانین مەموزین بگەلەك نوسخا هاتیە چاپکرن و هژمارەکا مەزن ژ دەستخەتێد مەموزینی ل سەرانسەری کوردستانێ بەلاڤن ، هندە جارا ژی ببارو زروفێد بزەحمەت هاتیەچاپکرن ، هەروەسا جودایی دناڤبەرا دەستخەتادا وەکرییە ، جودایی دناڤ مەموزینێد چاپکریژیدا هەبیت ... هندە ژوان بەرکەتیاژی ، ئەوێد مەموزین چاپکرین ، بڤی ڕەنگی یان بڕەنگێ هە ، شارەزای هەمی گرێك و ئالوزێید مەم وزینێ نەبووینە ، دا بدروستی داننە بەر دەستێ خاندەڤانا .. ئەڤەو گەر ئەم نرخ و بهایێد « خانی » و وەکی بلیمەتەکێ ژێهاتی بزانین ، کا چ کویرو هویر شعرا خوڤەهاندییە ، هەروەسا گەر هزرکەین کا « مەم وزین » ، کو ناڤدارترین داستانا شعرێیە د تورێ کوردیدا ، بو مە دروست دیاردبیت کا ڕاستکرنا چەند پەیڤەکێد « مەم وزنێ » ، دکیشی پلەو پایسکا گرنگیێ و پویتەپێکرنێدایە .. واتە ، مایتێکرن د مەمو زینا « خانی » دا ، بەر پسیارییەکا ئێکجار مەزن و ترسناکە نە بەرامبەری ئەدەبی بتنێ بەلکو بەرامبەری ملەتی .. چونکی گرانترین و گەشترین مراری د ڕستکا ستوێ ئەدەبێ کوردیدا بێ گومانە کو مەموزینە ...

د گوتارێ ناڤبریدا ، سەیدای هندە تێبینی لسەر مەموزینێ دیارکرینە ، یان بڕاستی نە ل سەر هەمی نوسخێد مەموزینێدا ، بەلکو بتنێ لسەر نوسخا « ڕودینکو » ی ، و سەیدای ل بەراهیا گوتارێ خوڕێ یاخوشکری ، بو هەر بیرو هزرەکێ دەربارەی گوتاری ، و بسنگەکێ بەرفرەهـ ڕێکا ئاخڤتنێ ڤەکرییە ...

سەیدا د گوتارێ خوٚ ، بەحسێ ڕاڤەکرنا مەموزینێ دکەت دبێژیت : [ ئەودێ ئێکێ بێژیت وئەز ئێکا دیوسەیدایەکێ دی ئێکا دی ، بڤی ڕەنگی دێ گەهین ئان نێزیکی ڕاستیێ و دروستیێ بین ، ئەڤەژی خلمەتەکا هێژاو پیروٚزە ] ژبەر هندێ مروٚڤ یێ پشتڕاستە ژگفت و گوٚیێ ، و ڕێ نە بوٚ من بەلکی بوٚ هەر کەسەکێ یاڤەکری یە ، هەروسا سەیدا دبێژیت : -

[ گەلەك ڕێك نەکەتن ل ڤێڕاچوونا مەموزینا ڕوٚدینکو دیاردبن . من هندەك ژوان لێرەو لدوی زانینا خودانان دا ل پێشی چاڤێد هنگو بن و حوکمی لسەر بدەن نەخاسمە ئەڤ کتێبە ل هەموو جهان دهێتە خواندن کە دەرس ]-2- - دەربارەی مەموزینێد چاپکری ، سەیدا دبێژیت [ دوو نڤشتا بتنێ خوٚ نێزیکی ڕاستیێ یێکری ئێك ژوان « مەم وزین » چاپا عامودە سالا 1947 ، یا دوویێ « م . ب ڕوٚدینکو ، موسکو 1962 ]-3- پاشی دەربارەی مەموزینا « بوٚز ئەرسەلان » سەیدا ڕەخنێ ژ گوٚتنا « د . عز الدین رسول » دگریت ئەوا دبێژیت [ هەر وەکو دبینم بوز ئەرسەلان ژ هەمی کەسێد لدوور مەموزینێ نڤیسین چاکتر تێگەهشت ]-4- ڕەخنا سەیدایێ « ئەمین » لسەر ڤێ ڕایێ ئەڤەیە : [ ئەڤ چەندە نەدروستە ژبەرکو یا پڕی خەلەتییە چ ژ لایێ مەعنایێڤە ئان نڤیسینا مالکێت بەیتێ ، ژبەر هندێ من دانا ڕەخەکی ]-5- !!!

دەربارەی ڤێ مەسەلێ هەژی گوٚتنێیە ، ئەم بێژین ، بوٚ هەر کەسەکێ بڤێت کەهیتە ڕاستیا نڤیسینا مەموزینێ ، یان بتویژینیت ، یان ڕاڤەکەت ، نابیت خوٚ ب نوسخەیەکێ یان دووان پشتڕاست کەت ، بەلکوٚ دڤێ ئاگەهداری هەمی نوسخەو هندە دەستخەتێد مەموزینێ بیت ، مەموزینەکا وەکی یا « بوٚز ئەرسەلان » هندا ژێهاتی و بەرکەڤتی یە ، نەیا هندێیە ئەم « دانینە ڕەخەکی » ، ژبەر هندێ کو نێزیکترین نوسخەیە ، و خودانێ وێ نێزیکترین کەسە ، بوٚ مەلبەندێ « خانی » و مەموزینێ ، د ناڤ وان کەسان دا ، یێد مەموزین نڤیسین ، « بوٚز ئەرسەلان » نێزیکی شێوێ ئاخڤتنا « خانی » یە ، و ئێکە ژوان کەسا یێد ژ هەمیا پتر مەمو زینێ تێدگەهیت هەرچەندە یا ژ هندە خەلەتیا ڤالا نینە . هەکە هندە چەوتی و خەلەتی تێدا خویابن ، نەمازە هندە پەیڤێد فارسی ، ئەڤە ئەگەرا هندێ نوسخا وی ببشت کومڤە بێتە هاڤێتن ، هەکە ئەڤ لایێ « سەلبی » تێدا هەبیت ، خو لایێد دی هەمی « ئیجابی » ، نە ، ئێك ژوان لایا یێ ژ هەمیا دیارتر ئەوە ، کو وی « مەموزین » ب تیپێد لاتینی نڤیسی یە ، کو فونەتیکا ئەزمانێ کوردی بدروستی تێدا دیارە ... ژبلی هندێ ژی « بوٚز ئەرسەلان » شارەزاییەکا باش د توری کوردیدا هەیە ، و نە هەر « مەم وزین » نڤیسی یە .. ڤێجا هەر نڤیسەرەکێ بڤێت بدروستی « مەم وزینێ » ڕاڤە کەت ، ئەڤ خالە ، واتە دویر ئێخستنا مەموزینەکا وەکی یا « بوٚز ئەرسەلان » کارێ وی لاواز و بێهێز دکەت !!!

ژ لایەکێ دیڤە دەمێ سەیدا ناڤێ کتێبا « د . عزالدین » دبەت دبێژیت [ من نێزیکی صەد بەرپەرا ژێ خواند من دیت کو لەز یاکری ]-6- ، هەروسا بوٚ کتێبەکا مینا وێ ، کو بەرفرەهترین ڤەکولینە لسەر مەموزینا خانی ، نابیت بتنێ سەیدای [ صەد بەرپەر ] ژێ خواندبن ، بەلکو دڤیا ژجارەکێ پتر بخوینیت ، چونکی ڕاڤەکرن و مەعنا کرنەکا زێدە گرنگ د وێ پەرتووکێدا هەیە ، من ل ڤێرە نەڤێت ئەز خوٚ بکەمە دناڤبەرا هەردوو نڤیسەرادا و بەرەڤانیێ ژ ئێکی بکەم یان نەکەم چونکی ئەو کارێ خودانایە ، هەروسا سەیدا یێ سەربەستە ، گەرهەر جورەکی ڕەخنێ ژ وێ پەرتووکێ یان ژ ئێکا دی بگریت ، مەبەستا من لڤێرە بتنێ ئەوە ، بوٚ کارەکێ زانستی مینا ڕاڤەکرنا « مەموزینی » چەوا یاڕەوایە سەیدای بتنێ « صەد بەرپەر » ژ کتێبێ خواندبن و !!! مەموزینا « بوٚز ئەرسەلان » بدەتە ڕەخەکی ؟؟ دەمێ ئەز ڤێ ئاخڤتنێ دکەم ، نە مەبەست پێ « تەزکیە » کرنا مەموزینا « بوٚز ئەرسەلان » ە یان پەرتووکا « د . عز الدین » و سەیدای مافێ هەی ، هەروسا هەمیا مافێ هەی ڕەخنێ ژێ بگرن ...

پێتڤی یە ، هەرکەسەکێ بڤێت مەموزینێ ڕاڤەکەت ، هەمی نوسخێد چاپکریێد مەموزینێ هەبن ، ژبلی چەند دەستنڤیسەکا و چو ژوان نە یێد هندێنە بدروستی پشت پێ بێتە ڕاستکرن ، هەرئێکێ ژوان چەند کێم و کاسیەك یێد هەین ، کو دڤێ هەمی پێکڤە ئێكودوو تەڤاف کەن ، دا بگەهینە بنواشەو بناغەیەکێ دروست بوٚ خاندنا مەموزینێ ...

گەر نوسخا « بوٚز ئەرسەلان » ژ لایێ پەیڤێد فارسیڤە ، تیك و

دەرز تێداهەبن ، خۆ نوسخا « رودینکو » ئەوا سەیدای پەسنا وێ کری‌و رەخنە ژێ گرتی ژ لاێ پەیڤێد عەرەبی‌و کوردی‌و فارسی تیك‌و دەرز لێ هەنە ، هەروسا نوسخا هەولێرێ ژی کێماسی دنڤیسینا پەیڤێد کوردی‌دا لێ هەنە و ژ لای فۆنەتیکا کرمانجیا ژووری‌ڤە ژی یا لقلقوکە !! هەروسا هندە پەیڤ ل ڤێرێ یان ل وێرا هە هاتینە گهورین .. هەژی گۆتنێ‌یە ، کو نوسخا [ عامودە .. سالا 1947 ] ئەوا سەیدای پەسنا وی کری ، بناغە و بنواشەیە بۆ چاپا هەولێرێ یا سالا 1954 ، 1968 هاتیەچاپکرن . واتە رەحمەتی گیوێ موکریانی پشتا خۆ ب چاپا « عامودە » ڤە راستکری‌یە ...

ژبەر هندێ بۆ مە باش خویادبیت ، کو چو نوسخە ژوان راست ودورست نینن ، لێ ئەرکێ راڤەکەری ئەوە وان نوسخا لێك بدەت ، و رێزێد جوانێد « خانی » ڤەهاندین بدروستی بطەیسینیت‌و برق ڤێ بکەڤن .. ئەڤەژی کارەکێ بساناهی نینە .. بەلکو دوو سەد و ئێك رەنج پێ دڤێن ، « خانی » دوو سەد رەنج برینە ، بلا ئەم ژی ئێکێ ببەین ...

لەورا دیاردبیت ، گەر سەیدای ڤەفتەکا خەلەتیا ژ « رودینکو » گرتبیت ، هندی وان ژی خەلەتی یان پتر ماینە ، هەر وسا هند د نوسخێد دی‌ژی‌دا هەنە ..

ژنەکا « ئویرس » مینا [ رودینکو ] هند ئەرك‌و زەحمەت کێشابن ، کومەکا دەستنڤیسێد « مەم وزینێ » جەماندبن‌و تویژاندبن . کو نە بدروستی کوردی دزانی‌و نە عەرەبی‌و نە فارسی .. بۆ مە خویادبیت چ زەڤیەکا ئاسێ‌و رەق وێ کێلایە ، دگەل هندێ‌ژی ژ روحا زانستی نەدەرکەڤتیە‌و گوتی‌یە : کێماسی د کارێ مۆدا هەنە‌و رامانا گەلە پەیڤا هتا دویماهیێ من نەزانی‌یە-٧- .. لەورا دڤێ ناڤێ قەدر گراینێ هەمیشە دگەل ناڤێ وێ بێتە گۆتن ، هەرچەندە چاڤ پوشی ژی نابیت دگەل نوسخا وێ بێتەکرن‌و بتنێ پشتێ پێ راستکەین ، هەروەکی بۆ نوسخێد دن ژی مە گۆتی .

کورتی‌یا ڤێ ئاخڤتنێ ئەوە ، گەر سەیدا دەستویرێ بدەت ئەم ژی ژبۆ دەولەمەندکرنا بابەتی دێ چەند بیرو هزرەکا دیارکەین ، بەلکو چریسکەکا روناهیێ بێخنە سەر وێ ڤەکولینێ : -

1- دڤیا بۆ راستکرنا وان رێزێد شعرێ ، سەیدای بەحس ژ نوسخێد دی بێد « مەم وزینێ » کربا ، کا وان ژی مینا « رودینکو » خەلەت کرینە ، یان بدروستی نڤیسی‌نە ، هەر وسا دا دیاربیت ، کا سەیدا ئێکەمین کەسە وان راست دکەت ، یان ژی بەری وی هاتینە راستکرن ... چونکی کارێ زانستی‌و سا دخوازیت ، ڤەکولەر [ باحث ] ی ئاگەهـ ژ هەمی لایێد بابەتی هەبیت ، هەکە هەبیت [ کو بێ گومانە سەیدای نوسخێد دی هەنە و دیتینە ] دڤیا دگەل یا رودینکو بەرهمبەر کربانە ..

2- د فەروزێد خۆدا ، کو سەیدای چل‌و هەشت فەروز نڤیسی‌نە چل‌و سێ فەروز ژوان ژ نوسخا « رودینکو » نە ، و پێنجێد دی جودانە ، بەلێ چو پەیوەندی بنوسخێد دیڤە یێد « مەم‌وزینێ » نینە ... واتە ، سەیدای چو ژوان نەکرینە سەر چاوە-٥- ...

3- ترا سەیدای مەعنا پەیڤا ژ کێش ژێدەری‌و کیش ئەزمانی دەرئاینە ، دا خاندەڤا بشێت ڤەگەرێتە وان ژێدەرا ..

4- سەیدای گەلەك پەیڤ بتابیەتی یێد عەرەبی ب رێ‌نڤیسا نوی نەنڤیسی‌نە ، دا بدروستی بزانین کا سەیدا وان پەیڤا چەوا دخوینیت !!!

دگەل هندێ ژی دێ نهۆ گنگەشێ لسەر چەند تێبینیەکێد سەیدای کەین : -

1- سەیدا دبێژیت [ بۆ نموونە دکتێبێد خاندنگەهادا چەند مالك ژ « خانی بو دجلە دبێژیت » ] ، بڤی شکلی دنڤیسیت‌و دبێژیت ئەڤە راستە : -

قەط نینە ژبۆ تە قەرارەك
غالب د دلێ « تەدا » نەیارەك

و سەیدا وێ رێزێ یا د کتێبا دا هاتی بخەلەتی ددەتە قەلەمی کو هاتیە نڤیسین : -

غالب د دلێ تەدانە یارەك

واتە گنگەشە لسەر پەیڤا دویماهیێ‌یە ، « یارەك » یان « نەیارەك » .. سەیدا بۆ قاهیمکرنا رایا خۆ چو سەرچاوا نائینیت ، هەژی گۆتنێ‌یە ، ئەژی دبینم یا کتێبا دروستترە نەکو یاسەیدای ، چونکی دهەمی نوسخێد مەم‌وزینێ‌دا بڤی شکلێ

خوارێ هاتیە نڤیسین : ـ

| | | |
|---|---|---|
| گێویٔ موکریانی—[10]— : | یارەك | ل 101 |
| بوز ئەرسەلان—[11]— : | یارەك | فەروٚزا ل 252 |
| عامودە—[12]— : | یارەك | ل 71 |
| رودینکو—[13]— : | یارەك | ل 109 |
| ب—[14]— : | یارەك | |
| ز—[15]— : | یارەك | |

ژبەرهندێ کو چو نـوسخەو دەستنڤیسێـد مەموزینێ پەیڤا « نەیارەك » بکارنەئینایە ، پێتڤیبوو سەیدا دیارکەت کا وی چەوا « نەیارەك » پەسنکرییە ، لێ یا ژهەمیا گرنگتر ئەوە ئـەم بو ڕاڤـەکرنـا « مەموزینێ » پشتێ ب « خـانی » بخـو قاهیمبکەین ، مەبەستا « خانی » ئەوە ، مەم دبێژیتە دیجلەی لەوا تو هندێ بپێك و شلقی دیارە تەژی « یارەك » بێ د دلدا ، لەوا تو هندە بێ سکـون و قراری ، تـە دڤێ تو زوی بگـەهیە « یارێ » خو ، بلا خاندەڤانێ هێژا هویر هزرا خو د وان دوو ڕێزێد شعرێدا بکەت ئەوێد لدوی وێ ڕێزێ تێن : ـ

**هەر لەحزە تەژی چ تێتە بیرێ**

**سەرگەشتە دبی ل ڕەخ جزیرێ**

**ئەڤ شەهرەیە گەر ژبو تە مەحبوب**

**حاصل گەرپایە بو تە مەطلووب—[16]—**

مـەمێ دبێژیتـە « دیجلە » ای دیـارە « بـاژێـرێ جـزیـرێ » مەحبوبێ تەیە ، لەوا بلەز و سەرگەشتەو سەرگەردان قەستا « جزیرێ » دکەی هەکە ئەڤ باژێرە « یارێ » تەیە ، مەحبوبێ تەیە ، ما تە چ دڤێت ، تو گەهشتییە مرادا خو ، و مەطلوب ژبو تە حاصلبوو ، بەلێ تو بو من چ دبێژی ؟ ئەز دێ کەنگی گەهمە یارا خو ، ئەها ئـەڤەیـە جودایی لنـاڤبەرا من و تـە « ئەی دیجلە » ، تو لەزێ دکەی دا بگەهیە یـارا[؟] جزیـرێ » لێ ئەز ناگەهمێ لەورا فەرە تو شوکرا خودێ بکەی !!

**هێژا ژ خودێ تو ڤوکرێ نلکەی**

**هەر ڕوژێ هزار شوکرێ نلکەی—[17]—**

بەلێ پا ئەز چ بکەم ؟ هەر چ بکەم بو من ڕەوایە !!

**هەرچی وەکو ئەز بکەم ڕەوایە**

**مەعقوولی ژبو مەرا فەنایە—[18]—**

ئەو خالێد بو چوونا سەیدای لاوازدکەن ئەڤەنە : ـ

أ ـ « خانی » وە نەگوتییە ، بشاهدێیا هەمی نوسخێد مەم وزینێ ..

ب ـ کەس نەیاری ناکـەتە د دلێ خـودا ، دەمێ دبێژیت : ـ « غالب د دلێ تەدا « نەیارەك » .. » لدوی بوچوونا سەیدای .

حـ ـ ژلایێ ڕێزمانا کوردیڤە ، بێسەروبەرە ، گەر وەکی هزرا سەیدای بیتن، دڤیا شاعری گوتبا :

غالب د دلێ تەدایە « نەیارەك » یان : ـ

غالب د دلێ تەدانە « نەیـارەك » ... هنگیژی ژبلی ڕیـزمانێ برگەیەکا شعرێ زێدەدبیت و کێشی تێکدچێت !!!

2—سەیدای ڕێزەك بڤی شکلی ڕاستکریە : ـ

**شەمعی نە ژ قسم نورو ناری**

**شەمسی ژ عەیان تو پەردەداری—[19]—**

و سەیدای [ ژ عەیان ] شوینا [ نەعەیان ] دانایە ، هەروەکی « ڕودینکو » نڤیسی ، لێ نوسخێدی پێد مـەموزینێ هەمیـان بەری سەیدای « ژ عەیان » نڤیسییە ، نزا چما ئیشارەتێ وان سەرچاوا نەکرییە : ـ

| | | |
|---|---|---|
| گ . م : ـ | ژ عەیان | ل 21 |
| ب . أ : ـ | ژ عەیان | ل 20 |
| ع : ـ | ژ عەیان | ل 3. |

دڤێت پەیڤا « قسم » یا سەیدای نڤیسی بـڕێنڤیسا نوی هاتبا نڤیسین و بیتە [ نە ژ قسمێ نورو نارێ ] .. دا کێشا ڕێزێ دروست ببیت ...

3—سەیدای خەلەتی ژ « ڕودینکو » گرتییەو ئەڤ ڕێزە هوسا ڕاست کریە : ـ

**بلجوملە ژبو مەڕا ل کارن**

**ڤیلجوملە ژبو مە بەردبارن—[20]—**

دەربارا پەیڤا « فارسی » یـا دویماهیێ دڤێ بێتـە نڤیسین [ بـووردبارن ]—[21]— نـەکو [ بـەردبارن ] ، کـو ڕامـانـا « متحمل ، صبور ، بێن فرەهـ ، باربەر » ددەت ، خودێ ئـەڤ دینـایـا مـەزن و ئـەڤ کـەواکبێـد لڤلڤي بـو مـە دروستکـرینەو هـەمی دخزمـەتا مـەدانن و بێنفـرەهـ و باربەرن بـو خزمـەتێ ، [ و جعلنا الارض ذلولا ] .. کـو « بەردبارن » چو مەبەستا ناگەهینیت .. ڕێـز بخو ژی ل

نوسخێد دن وەسا هاتیەنفیسین ..

4– ڕێزا خوارێ بڤی شێوەی ڕاستکریە : –

**عرفان طەلەبێد صاحب ئدراك**

**دەرحقێ تە گوتِ ماعەرەفناك– ¤ –**

سەیدای پەیڤا « گوتە » ل با « رودینکو » کریە « گوتِ » ، لێ نزا ئەو پەیڤ چەوا خواندییەو دەورێ وێ ژێرێ « کسرە » لبن پەیڤێ چیە ، کا « گوتی » یە ، یان « گوت » ە ، ل دوی هزرا من ئەڤ ڕێزا شعرێ ، ژ لایێ نفیسینێو مەعنایێ و کێشێڤە دڤێ هوسا بێتە نفیسین : –

**عیرفان طەلەبێد د صاحب ئیدراك**

**دەر حەققێ تە گوتی «ماعەرەفناك»**

سەیدا دبێژیت : « د چاپێد دیدا « گوت » هاتیە نفیسین » لێ دەمێ من سەح کریە بۆ ئەرسەلان ب « گوتی » یا هاتیەنفیسین .. هەروەکی دیارە من تیپا « د » بەرێ « صاحب ئیدراك » دانایە ، کو کێشا سعرێ پێ ڕاستدبیت ، و « ماعەرەفناك » من کرە دناڤ کڤانادا ، چونکی پەیڤا پێڤەمبەرییە « س » و نەیا خانییە .. گەر « گوتە » ژی بنفیسین هەر ڕەوایە ، هەروەکی « رودینکو » نفیسی ، چونکە هندە شێوید کوردی هەنە « گوتە » دڤێ دەلیڤێ دا بکاربینین دروستە ، و چو مەعنا نائێتە گهورین ، سەیدای ژی بەرواری کرینە نموونە بۆ وێ چەندێ ڕاستە ..

5– د ڕێزەکا شعرێدا سەیدای پەیڤا [ ئیزعان ، إذعان ] هلگرتیە و بێ چو سەرچاوەو ژێدەر هەبن پەیڤا [ ئەزهان اذهان ] ل شوێنی دانایە ، سەیدای ئەو ڕێز هوسا نفیسییە : –

**علمو هونەرو کەمالو ئەزهان**

**شعرو غەزەلو کتابو دیوان– ¤ –**

سەیدا دبێژیت [ ئەو بخو بدروستی « ئەذهان » ە ، ئانکو ڕەوشەنبیری ، چاکزانی ، ژبەر هندێ هۆ دهێت براستی ] ..

نزا چەوا « ئەذهان » دبێتە ڕەوشەنبیری ، چاکزانی ، « ذهن ، اذهان » کو پەیڤەکا عەرەبییە لکیرێ و ڕەوشەنبیریو چاکزانی لکیرێ ؟؟.. کو «ئەذهان » د وێ مالکا شعرێدا ، گەلە تشتەکی کەچە !! دگەل علمیو هونەریو کەمالێ « ئەذهان » هەبیت ..

| | | |
|---|---|---|
| گ . م : | إذعان | ل 37 |
| ب . أ : | ئیزعان | ل 62 |
| ع : | إذعان | ل 16 |
| ر : | اذعان | ل 35 |
| ب : | إذعان | – |
| ز : | إذعان | – |

لدوی هەمی نوسخەو دەستنفیسێد «مەم وزینێ » و لدوی ڕامانو مەبەستێد شعرێ ئەڤ ڕێزا شعرێ بڤی ڕەنگییە : –

**عیلمو هونەرو کەمالو ئیزعان**

**شعرو غەزەلو کیتابو دیوان**

6– ڕێزە شعرێد سەیدای هژمار « 5، 11، 12، 13، 14، 15، 17 » بۆ دانایین د گوتارێ خۆدا ، ووی ڕاستکرین ، بارا پتر ژ ژێدەرێن « مەموزینێ » بەری وی بدروستی نفیسینەو سەیدای ئیشارەت نەکرینەو گەلە جودایی دناڤبەرا وانو «رودینکو » دا نینە ، لەوڕا پێتڤی نابینم لسەر بپەیڤم– ¤ – ..

7– سەیدای ڕێزە شعرەکا دی بڤی ڕەنگی ڕاستکرییەو هوسا نفیساندییە : –

**لێ زادە دورمان دملت**

**نوبادە پوستان عفت– ¤ –**

هەرچەندە سەیدای ئەڤ ڕێزە شعرە بڕێنفیسا کەڤن نفیسییەو فۆنەتیکا وێ ئاشکەرا نینە ، لێ چەوابیت ئەمێ کنگەشێ لسەر کەین ، و سەیدا دبێژیت ، [ د بنیاتێدا بڤی شکلی سەری هاتیە ] ، لێنزا کێش بنیاتە ؟؟ ئەم دێ وان سەرچاوا ڕێزکەینو هێڤا کەینە کەرێ دویماهیێ یێ شعرێ چونکی گنگەشە لسەروێ پرتێیە : –

| | | |
|---|---|---|
| گ . م : | نەوبادەیێ بوستانێ عیففەت | ل 44 |
| ب . أ : | نۆبادەی بوستانێ عیففەت | ل 84 |
| ع : | نوبادۀ بوستان عفت | ل 23 |
| ر : | نوبارە بوستان رفعت | ل 45 |
| ز : | نەوباوەئێ بوستانێ ڕەفعەت | – |
| ب : | نەوبادەیێ بوستانێ عیففەت | – |

هەروەکی دیارە پەیڤا بەراهیێ بڤان ڕەنگا هاتیە

[ نەوبادە نەوباوە ، نەوبارە ] و پەیڤا دووێ هەمی جارا « بوستان » هاتیە نەوبادە : شەرابا نوی یان مەیا نوی [26] نەوباوە : فێقیێ نوی گەهشت [27]

بوستان : باخچە ، جهێ دارێد فێقی ، چەم [28] ..

یادیارە کو دەمێ « خانی » پەسنا هەردوو خویشکا دکەت « ستیو زین » ێ دبێژیت : زادەو بوییێد ، یان تێژکێد مالا میری ، و بنەمالا دەولەتێ و فێقیێ نوی گەهشتی د باغو بوستانێد عیففەتێدا ، دوو بوون کو ستیو زینن هەروەکی د ریزێد دی یێد شعرێدا لدوی تێت ..

**شەهزادە دوو بوون لنك وی شاهی**

**خورشید دوو بوون لنك وی ماهی [29]**

گەر ئەم « نەوبادە » ژی ، پەسندکەین ، کو د هندە نوسخادا هاتیە ، هەر دبیتە شەرابا نوی ژ فێقیێ بوستانێ عیففەتێ ، کو هزرا من براستی بۆ ناچیتو ئێكسەرە بۆ « نەوباوە » دچێت ، بو فێقیێ تەرێ تازە پێ گەهشتی دچێت ... گەر ئەم ئاڤریەکێ ل راڤەکرنا سەیدای ڤەدەین ، دێ بینین پەیڤا « پوستان » ئانەکو : چچك یان مەمك شوینا بوستان دانایە ، و نۆبادە بکارئینایە ، ئانەکو شەرابا نوی ، تازە ، و گۆتیە : زادەو بوییێد مالا میری یێد فرشك حەلالو شیری « شەرابا » ژ چچکێد پاقژو عەفیف ڤەخواری !!

ئەو خالێد بوچوونا سەیدای لاوازدکەن ئەڤەنە : ـ

أ ـ دچو نوسخادا پەیڤا « پوستان !! » نەهاتیەو گەر « پوستان » با ، بئەزمانێ فارسی وەلۆ نائێتە نڤیسین ، بەلکو پستان یان پیستان دئێتە نڤیسین ، دەمێ فەرهەنگا عەمید یا فارسی پەیڤا « پستان » راڤەدکەت دبێژیت « بکسر اول » ، ..و « بوستان » بدروستی هاتیە نڤیسین مینا ئەزمانێ عەرەبی ، کو ، چەمە یان باغە یان جهێ فێقی‌یە ..

ب ـ « خانی » ێ زانا د شعرێدا ، مەعنایەکا هندە لاواز بۆ شعرا خۆ نادانێت ، و بێژیت : مەیا نوی شوینا شیری ، د مەمکێد ژنکێد مالا میریدا هەبوو .. یان وان « مەی » ددا زاروێد خۆ . لەورا ئەو ریزا شعرێ دڤێ ئەڤە بیت : ـ

**لێ زادەئێ دوودمانێ دەولەت**

**نەوباوەئێ د بوستانێ عیففەت**

8 ـ ریزەکا شعرێ ، یا گەلەك ئاشکەراو دیار یاهەی دبێژیت : ـ

**هن جامە دوریدە ، هن دسەرخوەش**

**هن عەقل رەمیدە ، هن موشەووەش**

لێ سەیدای بێی چو سەرچاوەو بنواشە هەین پەیڤا « سەرخوەش » دگهوریتو دکەتە « بەرخوەش » و ریز بڤی رەنگی نڤیسی‌یە : ـ

**هن جامە دریدە هن دبەرخوەش**

**هن عەقل رەمیدە هن مشوّش [30]**

و راڤەدکەتو دبێژیت [ بەرخوەش : کارکری ، جلك نویو تازە ، کوك .. ] .. بەری ئەم بەحسێ نوسخێد دی یێد مەمو زینێ بکەین دێبێژین : « بەرخوەش » نینە ، و کەسێ گوهـ لێ نەبوویە د ئەزمانێ کوردیدا ، « بەرخوەش » براماناا « جلك نویێ » هاتبیت ... هندی من پسیارکری د چو شێوێد کوردیدا بوێ مەبەستێ نەهاتیە بەلکو لهندە دەڤەرێد کوردستانێ دەمێ ئامانەك « بۆ نموونە ئامانێ ئاڤێ » نێزیکی تژیاتێی بیت ، دبێژن ئەو ئامان یێ بەرخوەش بووی ، یان نێزیکی پربوونێ بووی .. دیارەژی کول ڤێرە ئەو پەیڤ جهێ خۆ ناگریت ، نوسخێد دی هەمی « سەرخوەش » ن بـ وی پەیڤێ : ـ

| | | |
|---|---|---|
| گ . م : | سەرخوەش | ل 54 |
| ب . أ : | سەرخوەش | ل 116 |
| ع : | سەرخوەش | ل 31 |
| ر : | سەرەخوەش | ل 56 |
| « ب » و « ز » : | سەرخوەش | |

9 ـ ریزەکا دی یا شعرێ هەیە : ـ

**دیتن خوە بپاچەبەندو زەنگل**

**پەروازو فرین مەحالو موشکل**

دەمێ « مەم تاجدین » ژ نەهشیاریا خۆ رادین ، کو ژبەر دیتنا « ستیو زین » ێ نەهش‌ببوون ، « خانی » وەسا سالۆڤا وان ددەت .. سەیدای ئەو ریز هۆسا نڤیسی‌یە : ـ

**دیتن خوە بـ پاچەبەندو زەنگول**

**پەروازو فرین مەحالو مەشکول [31]**

پاشی سەیدا راڤەدکەتو دبێژیت : ـ [ ئەم دبینین « زنگل » چ کرێدانەك نینە لگەل مەعنای بەلێ ، زەنگول : خۆ خراندن ، ] و ژبەر هندێ چونکی سەیدای « زەنگل » کری‌یە « زەنگول » یادی ژی کری‌یە « مەشکول » کو بمەعنا :

« بزه حمەت » ددهته قەلەمی . [ پاچەبەند : پێ گـرێدای ، پەرواز : لوط ] ، ودیسا سەیدای نەگوتی‌یە کا ئەڤ مەعنایە ژ کیڤە ئانینەو ژ کیش ژێدەری !! لدوی بوچوونا سەیدای دڤێ مەعنا رێزێ ئەڤە بیت [ دیتن خوە پێ گرێدای‌و خو خراندن ، لوطو فرێت بزەحمەتە ] ...

دەمێ ئەم ل نوسخێد دی دنێرین : -

| | | | |
|---|---|---|---|
| گ . م : | زەنگول | مشکل | ل 58 |
| ب . أ : | زەنگل | مشکل | ل 126 |
| ع : | زنگل | مشکل | ل 34 |
| ر : | زنگل | مشکل | ل 60 |
| ب : | زەنگل | مشکل | - |
| ز : | زەنگل | مشکل | - |

« خانی » د ڤێ رێزا شعرێ‌دا ، مەبەستا خو بجوانترین رەنگێد رەوانبیژیێ دەردئێخیت ، « مـەم‌و تاجـدین »[1] بدوو بالندێد جوان‌و قەشەنگ ناڤدکـەت ، لێ بالنـدێد کـەهی‌نە ، لەورا د پێ گرێدای‌و ستو زەنگن ، و ژبەر هندێ نەشێن بفرن ، چونکی گرێدایێد ئەشق‌و ئەڤینێ‌نە ..

پاچەبەند .. نە پێ‌گرێدایە هەروەکی سەیدا بو چووی ، بەلێ ئەو داڤا بەنکی یان وەریسێ زراڤە یێ پێد طەیرا « بالندا » پێ گرێ‌ددەن ، واتە ئامیرێ گرێدان طەیرایە لەورا گوتی یە [ دیتن خوە بـ پاچەبەند ] .. فەرهەنگا طلائی دبێژیت : -

[ پـاچـەبـەنـد : حبـل تـربـط بـە اقـدام الطيـور اثنـاء تربيتها .. ]-[33]-

خـانی ئەڤ وێنێ شعـرێ هند جـوان کێشـایـە - کـو پەیوەندی بنیڤ مالکا دووێ‌ڤە هەبیت ، چونکی بالندەنەو دپێ گرێ‌داینە ، لەورا بەحسێ فرینێ کری‌یە ، و گوتی‌یە نـەشێن بفرن گەر نیڤ مالکا بەراهیێ بەحسێ بالندا نەبیت ، چما ئەو ناڤێ پەروازو فرینێ دئینیت ..

زەنگل ، زەنگولە ژی : زەنگلەکا بچووکە دکەنە ستوێ بالندەو گیانەوەرێد کەهی بو جوانیێ ..

پـەرواز : هەر فـرینە ، مـەحال‌و مـوشکـل : مـوستـەحیلەو موشکیلەیە .. ژبەر هندێ مەعنا رێزێ چەند جوان دیاردبیت ، کو وان هەردوو ئاشقا بدوو طەیرێد پێ گرێدای‌و ستو زەنگـل دشوبهێنیت کو نەشێن فرو پەروازا بکەن !!!

10 — هەروەسا رێزەکا دی یاهەی : -

**ئوسکوفەکە ظولمەتێ بسەردا**
**جلفویەکە ئولفەتێ ببەردا**

خانی دبێژیت : -

دەمێ مەم‌و تاجدین ژ نەهشیاریێ رابووین ، خو وەسا دیت کو ئەشـەفقـەیەکێ طاریـایتێ یێ لسەر سـەری [ شەڤ بوو ... ر . ف ] و لەهی‌یەك « لافاوەکا » ئەڤینێ یا دبەردا دچێت-[35]- ..

سەیدای شوینا : ئـوسکوفـەکە : « اشکـویەك » و شـوینا : جلفویەکە : « جلویەك » یادانای‌و گوتی‌یە : اشکویەك ئـانکو بانەك‌و « جلویەك » ئانکو ، نەحە ز ، و گوتی‌یـە : اسکوفـو جلغو چ مەعنا نادەن-[36]- .. هەرچەندە وەکی هەرجار سەیدای دیار نەکری‌یە ، ئەو مەعنا دکیش ئەزمانی‌و کیش فەرهەنگێ‌دا هەنە ، و گوتی‌یە ئەڤە راستەو یادی خەلەتە ، لێ مەعنا لدوی بو چوونا سەیدای ئەڤەیە : [ بانەکێ طاریـاتیێ بسەردا ، و دوژمنەکێ ئولفەتێ بـ بەردا ] .. کا دێ چ مەعنای دەت ؟؟ و چەوا چێ‌دبیت « دوژمنەکێ ئولفەتێ » دبەر ئێکی‌دا بیت ، کو دوژمن‌و ئولفەت دوو پەیڤن مەعنایا دژی ئێك دگەهینن .. ئەڤ رێزا شعرێ د نوسخێد دی‌دا هوسا هاتیە : -

| | | | |
|---|---|---|---|
| گ . م : | ئەسکوفەکە | چەلفویەکە | ل 58 |
| ب . أ : | ئوسکوفەکە | جلفویەکە | ل 126 |
| ع : | اسکوفکە | جلفویەکە | ل 34 |
| ر : | اسکوفکی | جلفویکی | ل 61 |
| ز : | ئەسکوفەکی | جلفویەکە | - |
| ب : | ئەسکوفەکە | چەلفویەکە | - |

بنێرە هەمیان « ئوسکوفەکە » نفیسی‌یە ، لێ هەر ئێکی بـ ئیملایەکا تایبەتی ، هەروسا « جلفویەکە » ژی هندا دروست نفیسی‌یەو هندا کری‌یە « جلفویەکە » !!!

11 — دەربارا رێزا خوارێ : -

**ئەڤ رەنگەهەوان دکر تەفەگوص**
**ماهیەتێ حالێ خوە تەجەسوس**

سەیدا دبێژیت [ [تجسس] خەلەتەو [ تحسس ] دروستە . و ئـەڤ چێکا کـەتیە بن « ح » و کـریە « ج » مـەعنـا مـالکێ تێکدا .. ] براستی گـەر « تحسس ] ژی بیت مەعنـا نائێتـە

گهورین‌و چو ژوان مـەعنایێ تێـك نادەن ، لێ نـوسخا هـەمیا « تجسس » نـڤیسي‌یـەو چـو ژوان ئـەو « چـپـك » ژبـیر ـەکری‌یە : ـ

| | | |
|---|---|---|
| گ . م : | ل | 58 |
| ب . أ : | ل | 126 |
| ع : | ل | 34 |
| ز : | ل | 61 |

هەروەسا « ب » و « ز » ..

12 — دەربارەی وان ڕیزێـد سەیـدای ڕاستکرین‌و هـژمارێـد [ 36 , 37 , 38 , 39 , 40 , 41 ] —[36]— بۆ دانایین ، هـەمی بەری هنگی بدروستی دگەلەك نوسخێد مەم‌وزینێ‌دا هاتینـەو پێتڤی‌ناکەت هەمیان دووبارەبکەم‌و بـەرپەڕێـد زێدە پێ ڕەش‌کەم .

**تێبینی** : گەلەك خەلەتی‌و چەوتی‌یێد هویرو موير تێـدا ماینە —[39]— لێ مە نەڤیا درێژکەین هەروەکی « خانی » ێ مەزن گۆتی : ـ

**ئەی خامە تە ژی گەلەك درێژکر**

**ئەڤ نامە بەسە تە پڕ قرێژ کر —[40]—**

## پەراوێز : ـ

1 — کاروان ـ ژمارە 16 کانوونی دووەم ساڵی 1984 ل . 21 .
2 — هەمان سەرچاوە ـ ل 22
3 — هەمان سەرچاوە . ل 21
4 — هەمان سەرچاوە . ل 21
5 — هەمان سەرچاوە . ل 21 .
6 — هەمان سەرچاوە ـ ل 21 .
7 — بنێڕە ، پێشەکیا کتێبا ڕودینکو ، هەروسا کتێبا د . عـز الدین رسول .. احمدی خانی .. ل 11 . 12
8 — کاروان 16 ، ل 27 .
9 — هەمان سەرچاوە ، ل 21 .
10 — گیوی موکریانی ، مەم‌وزین ـ هەولێر ساڵا 1968 ، [ ژنوکە ویڤە دێ وی ژێدەری ب « گ . م » نیشان کە م ] ..
11 — محمـد امین بـوز ارسلان ، مـەم‌وزین ـ استانبـول سـاڵا 1968 [ ژنوکە ویڤەدێ بـ « ب . أ » نیشان‌کەم ] ..
12 — بشـیر شیخ حسن هـاشمی ، مەم‌وزین ـ عـامودە سـاڵا 1947 . [ ژنوکە ویڤە دێ بـ « ع » ناڤ کە م ] ـ
13 — م . ب . رودینکو ، مە م وزین ـ موسکو ساڵا 1962 . [ دێ ژنهۆ ویڤە بـ « ر » ناڤ‌کەم ] .
14 — [ ب ] ـ دەست‌نڤیسەکە ژ « بامەرنێ » بـدەست من کەتیـە ، لەوڕا دبێژمێ [ ب ] .
15 — [ ز ] ـ مـەم‌وزینەکـا دەست‌نڤیسە ژ « زاخـو » بـدەست من کەفتیە لەوڕا ب « ز » بناڤ‌دکەم ..
16 — بۆنموونە بنێڕە « گ . م » ل 101
17 — سەرچاوێ بەرێ ، هەمان لاپەڕە .
18 — سەرچاوێ بەرێ ، هەمان لاپەڕە .
19 — کاروان ، « 16 » ـ ل 22 .
20 — سەرچاوێ بەرێ ، ل 22 .
21 — فەرهەنگا عەمید ، ل 251 هەروەسا فەرهەنگا طلائی ، ل 108 .
22 — کاروان 16 ، ل 22 .
23 — هەمان سەرچاوە ، ل 23 .
24 — هەمان سەرچاوە ، ل 22 و 23 .
25 - هەمان سەرچاوە ، ل 23 .
26 — طلائی ل 576 .
27 — فەرهەنگا عەمید ، ل 1204 ، فەرهەنگا طلائی ل 576 .
28 — عەمید ل 265 و 287 ، طلائي ل 114
29 — گ . م : ل 44
30 — عەمید : ل 333 . و طلائي : ل 157 بـ [ پستان ] نڤسیی‌یە .
31 — کاروان 16 ، ل 24 .
32 — کاروان 16 ، ل 25 .
33 — طلائی ل 133 .
34 — ئوسکوف Usküf : قلنسوە قدیمە ، المعجم الترکي العربي الجزء الرابـع ، عبداللطیف بنـدر ئوغلو و جمـاعەتـا خـۆ ، ل 433 . اوسکوف : شەفقەیەکێ درێژ بۆ ئەفسەرێد یەنیچەری ، بنێڕە فەرهەنگا « ریدهاوس » ترکی ـ انکلیزی ـ بیروت 1974 ، ل 254 .
35 — جلفـو : لەهی ، لەیی ، لێڤان ، لافـاو ، نـاسـەر ، فیضـان .. بنێـڕە : « م . ارسـلان ل 500 » کـو « جلفـو » بـ « لە یی » ڕاڤـەدکەت ، و پـاشی بنێڕە [ ضیـاء الدین الخالدي ، الهـدیە الحمیدیة في اللغة الکردیة ـ بیروت 1975 ص 209 ، بـۆ مەعنـا « لەیی » کو دبێژیت : السیل من المطر معروف ] ..
36 — کاروان 16 ، ل 25
37 — هەمان سەرچاوە ، ل 25
38 — هەمان سەرچاوە ، ل 26 . 27 .
39 — گەر هەمی هاتبانە نڤێسین . دا بابەت درێژبیت‌و بێ تام بیت .
40 — گ . م ل 178 .

# ژ مەموی بۆ زینێ

● نجيب صالح بالایی ●

«1»

دەستێ منێ لسەر گەردەنێ
بێ رازای مە
لبەر وێ بەژنێ
وێ بەربەنێ

* *

- هەرێ زینێ
دناڤ بەرا منو تەدا
بهۆستەکە .. جار قۆناغن
دناڤ بەرا منو تەدا
جار ئاگرە
جار ژی ئەو باخچەنەو باغن
- هەرێ زینێ ..
ئەز غەریبم .. تۆ غەریبی
ئەز میهڤانێ شەڤەکێ مە
ئەوێ شەڤێ ژی ئەز نەشێم ..
خالا گەردەنێ براموسم
تە هیناکەم .. تۆ دێ هیبی
هێ فەلەکێ
هار فەلەکێ
حەتا کەنگی
دێ تۆل عاشقا دوو ڕوببی ؟!
دێ تۆل عاشقا دووروببی ؟!

« 2 »

هەرێ زینێ
لبن پێت من ئێتوین هەلبون
لبن پێت من کانی دەربون
دەراڤێت ڤان بۆنە ڕووبار
دەنگ لێ دبۆ تازیو نیهار
من دی .. من دی
[ ئاڤا شێلی
هەرا پێلێت زەلال دخوت ]
من دی ... من دی
لبەر ڤێ ئاڤێ شینبون
دوو دارکەڤوت
دوو کۆترا
لسەر ڤان دارا
مل کرنە جوت
من دی .. من دی
ئێکێ ژوان
هەر « لاوك » و « خەم » دگوتن
یادی لێ ڤەدگێران
زڤروك بۆنە ئاشو
ماسی دهێران
ژ ڤان خەما
پەڕ لکوترا وەریان
هینگێ زینێ
د جەرگێ من ژیدا
هەل بۆ ئاگر
من هزردکر
مادەم دبێ پەڕن
چەوا دێ رزگاربن کوتر ؟!
بەلێ زینێ .. لێ خاتوینێ
د وێ کاڤێدا
من دی .. من دی
لسەر وێ ئاڤا هارو شێلی
قورمێ دارکەڤوتا
بۆنە دوو « کوچ »[*]
چەقو تا بۆنە پر
-هۆسا زینێ
دسەرڕا بورین
هەردو عاشق
هەردو کوتر
- هەرێ زینێ
ئەزو تۆژی
هۆسا دێ رزگاربین
هندی لگوندێ مە
هەر هۆ دارکەڤوت هەبن
هندی شەڤا مە ڕەشبین
ستێرێت عەسمانی گەشبین
هندی دارا ئەڤینا مە
کویر داهێلاین ڕهو ڕین
ڕهو ڕین

[*] کوچ : کوچا پرێ

# بێ پەساپۆرت

د . سعدی
1983/11/15

خۆزگە من باڵندە ئەبوم
بۆ کوێ بم ویستایە ئەچوم
ئەوسا ڤیزە یا پەساپۆرت
لەمن نابون بە کۆسپ و کۆت
کاتێ ئەفریم بە ئاسمانا ...
بەسەر گوندو شاری جوانا
بەسەر کەژو کێوو هەردا
بەسەر زەوی و زارو وەردا
بەسەر دەشت و بیابانا

بەسەر بەراوو بێستانا
بەسەر دەریاو گۆلی مەنگا
بەسەر باخاتی ڕەنگ ڕەنگا
بەسەر دوڵ و دارستانا
بەسەر کەپرۆکەی گوڵانا
جار جار ئەکەوتمە ناو مەلان
پۆلە پەپولەم هەڵ ئەسان
نامەی دلداریم ئەگەیان
وەك ئێستا زۆری ناخەیان

لە لوتکەی بەرز ئەم کرد درود
بۆ سپی گوڵ ئەم برد سرود
سرودی ئاشتی و سروشتی
فەرمو گوێ بگرە لەگشتی
لە کناچەی پۆڕ سەر لە بەهار
لە هاژەی ئاو لەرەی چنار
گمەی کۆتر قاسپەی کەوباڕ
چرپەی کولەفرەی ناو چاڕ
ڕازی قولنگ و قاز بەجەلە

کوێستان جی دێڵن بە پەلە
گلۆرەی زیخ لەقەد پاڵان
یەکەو گۆتەکەی منالان
ڕەوینەوەی ئاسك و مامز
خشپەی ڕەشمارانی چاوبز
پرمەی ئەسپی تێرو تەسەل
جوکەو جریکەی وردە مەل
ئەمانەن خۆشی بۆ مرۆڤ
لائەبەن لەدل ئاخ و ئۆف

# گفت و گۆیەک دگەل کۆترا سپی

● روباد دوسکی ●

هۆ کوترێ
کوترا سپی
ئەرێ بوچی تو دامایی ؟
هەروەك بەرێ تو نافڕی
دەشت و چیا
ڤان سنورا
هەروەك بەرێ تو نابڕی
تو نەکەتیە ناڤ چ داڤا
چ ئەلهویا
ئەز دبینم تو نە بری
دێ بێژە من
کوترا سپی
ئەرێ بوچی تو دامایی ؟
ئەرێ بوچی تو دامایی ؟

ئەز دبینم
گوڵێدبم
وەختێ دفرم دەنگێ زێمارێ
یا کەتیە سەر لێڤێت بویکا
نائیتە من
هەروەك بەرێ
دەنگێ لاوك و حەیرانوکا .
بشکورین بو
هاتە دزین
سەر هەردوو لیڤێت زاروکا ؟
خوها پالا
یا جوتیارا
دابەشکرن ئەوان دزا
لجڤاتان
ناڤ کوچکا .
ئەز دبینم
ئەو بخو دبێژن
هەر ئەمین عاشقێت نێرگزا
لدور چەما لدور ڕەزا .
باش بزانن
هەر هوین ئەون

وەریس داڤ بداڤ ڤەهاندین
بو سێ پێکا پێش کێش کرین
لشنوییێ لسەقزێ
بخوینا شەهیدان کەنین
بخوینا شەهیدان کەنین

کوترا سپی
ئومێدا من
ئەو شەمالکێت هاتین سوتن
دێ روناهی ژێ هێت هەلێتن
وەکی ڕوژێ
دەمێ نیڤرو
پیلێت خول چیان دەتن
خەونێت بچویك ومەزنا
ل تارییێ
ناڤ بەفرێدا
دێ بجهـ ئینیتن
دێ بجهـ ئینیتن

• حسن احمد عبدالله
1984/4/17 ـ قەڵادزە

(پێشکەشە بە سروشی ئەو هۆزا نەم) ..

# هۆ! مەلەکە..

« مەکە باوەڕ بە دیداری لەتۆ تێربێ دڵو دیدەم !
بەدیدارت ! هەتا مردن ، ئەگەر تێربم لە دیدارت » ـ ادب ـ

هۆهەوێنی
ئەشکی سورم !
پێ لێ دەنێ ی کە هەرگیز (کەو) ،
بەبێ بەفرو کوێستان ناژی ..
ماسیش بەبێ
دەریاو ڕوبار
کانیش هاودەمە بۆ ڕێبوار ...
باشە ئەی بۆ پێ لێ نانێ ی ؟!
کەمن ! بەبێ بەفری سینگت ،
بێ ڕوباری چاوی مەنگت ؛
وەك ڕێبواری ئێنوو ماندو ،
بێ کانیاوی خونچەی ئەنگت ،
دەمێك ناژیم !!؟ ...

• • •

... هۆ مەلەکە !
هەرگیز من خۆم بڕیار نادەم ؛
هیچ کاتێ بێمە سەردانت ،
ئەتها خۆتی ! کە دەمکێشی
هەروەك (حەوا) ی (باوە ئادەم) !!
... دەزانی بۆ ؟!
چونکە هەر جارێك کە کڕنۆش ،
دەبەم بۆ تۆ ؛
لە بەردەمت !
دەمی تینووم دەنێمە نێو
کانی دەمت
هەرچی هەیە لە پاڵندەی
ڕەنگو دادو ئێش و خەمت !!
لەناو لانەی سوتاوی من
دەرەوێنەوە ،
لەسەر دارستانی تاری
زوڵف و کەزیەی ژێر پەرچەمت
دەنیشنەوە !!

• • •

کچێ قوربان ...
دە ! دەست مەنێ بە ڕومەوە ..
بایۆ تارێك لە سای تۆدا ؛
ئەمی ناسۆر سەرم بەردا ...
بۆ ، وەی کاتێ جیا بومەوە
یان بۆ لانەی پڕ ئازاری ،
دێرینەکەی خۆم چومەوە ؛
خەمی تازەو چرو کردوت !
نەکشێ و نەبێ ،
بە دومەوە !!

• • •

... هۆ مەلەکە !
دە ! پێ لێ نێ
ئەمامی ناسکی ژینم
بە دەست و ژان و تاڵی دوریت ،

دێو دەهەژێ ..
خوێنی شادیم هەموی گرمی ،
ئاسۆری تۆیە دەیمژێ ..
دە ! پێ لێنێ گوڕپەی دڵم
بەبێ باوەشی گەرمی تۆ ،
ئۆقرە ناگرێو
ناتوانێ بژێ !..

● ● ●

هۆ مەلەکە !..
تۆ مەلەکەی فریشتانی ،
تۆ ڤینۆسی کوردستانی
تۆ ئاکە جوانو هەڵکەوتەی ،
شاری خونچیلەی بوکانی ..
تۆ ئاوارەی دەستی پیسی دوژمنانی !
دیلێکی هەست پێ نەکراوی
ڕەشترین سووچی زیندانی !
پڕنەریتی کەم بایەخو
هیچو پوچانی ژیانی ..
تۆ بەری ،
لە ماناى ژین ، لە هەستو سۆز
لە گشت شادیو بەختەوەری ..
... دەست بەسەری
تۆ ژنی گولە مێردانی !!!

● ● ●

لەسەر زمانی لەنگی من
ووتەو بەستەی
ئامانجی دورو نزیکی خاوەنی ئەم مەبەستەی
تۆ ئیلهامی !
سروش بەخشی ئەم هەڵبەستەی ! ...

● ● ●

... ئای کە تەمەنێکی کورت بوو !
ڕێبواری دڵەم ،
تێر لە سایەی بەژنی تۆدا
پشوی نەدا !...
بەرخی عیشقی برسی و تینووم
لە پاوانی پانی سینگت
لە کانیاوی سازی دەمت
قەت ئەوەندە ئامی نەکرد ،
کە دەستێکی پیس و چڵکن ..
نێوانێکی ڕەشی کردین

● ● ●

هۆ پەریەکە :
چبکەم ! ئێستاکە ، دەمزانی
کە چۆن بۆ تۆ !
بومە ئیشانەی ئەو خەڵکە !
یان زانیبات هەر لە دوای تۆ
کوندە پەپوی لێ دەخوێنێ
ئەو دەرکو بانو گەڕەکە ،

● ● ●

ئاوارەکە :
بێ چارەکە !
ڕێبوارەکەی ! هاتو نەهات !!
ئانەی ئەو خەڵکە ،
بێ کەڵکە !
.... ئەو برینانەم سارێژ دەبن
هەر بە پەشتانێکی بالات !
هەمو تۆانجێکم بیر دەچن
کە دێمە لات
کە دێمە لات !!

# لاپەرێ شعرێ

ئیسماعیل تاها شاهین
دهوك

## نافەرۆکا نڤیسادا

1983/2/1

رۆژەکێ ئەزێ چیایی ،
ئەزێ چەند گاڤا بشوونده مای ،
لخوه دگەریام بنهێنی .
گۆتنه من : کەسێ بەرزه ،
خوه دسپێره رۆژناما ..
خوه دسپێره نڤیسارا ..
خوه دسپێره هیڤی و کاما .
کورت .. کرمانجی
خوه دنخێڤت بهەمی تەرزا
چ هیڤیێا هەی ،
م داخوازکر
م رێنایێ هەمی خرشن
رۆژنامەو گۆڤارێن م هەین
م رێنایێ لم روو ترشن
چ کتێبا م بخوه هەی
درێنمێ ژ ترسا یا بەی
رووپەل هەمی م ڤەخواندن
م رێنایێ هەچکو دینم
چ رێزا چاڤێ م ڤێکەڤت
بەروڤاژی تێدەی شینم
م تفکره رەشەبێژا
بهزارا نفرین م شاندن !!!

---

## شعرو شاعر

1983/11/25

باوەرکن شعر نه ڤره
ئەژی ببێم وبێ بره
بۆ رەپ و رابوونا گەلۆ ..
شاعر ژ هەمیا ، بێ خره
باوەربکن ، یاژی نەکن
یا شاعرا نەهەر تره
نەهەر تره
شعر کێشا کریارانه
شعر ماکا ڤیرو هانه
شعر برپارەکا فەره
شاعر بخوه بێ دانه سەر
شعر بەرخوەرو خوەشچەره
شاعر بخوه مفتێ دەر
شعرا زیڤارا بارتێنه
شاعرێ خان و خوهـ ژێنه
بێسەر وتەبلارو پێنه
شعر برپارەکا فەره
شاعر بخوه بێ دانه سەر
شعر بەرخوەره ، خوەشچەره
شاعر کلیتێ سەد دەره

پەیڤێن گران :
ڤر : دەرەو
ببیم : چرک
هان : هاوار
برپار : لئێره برامانا بەرهەم تێ
مفت
کلیت : کلیل
زیڤار : ژار ، خێزان
خان و خوهـ : کەس و کار
تەبلار : ترەدین

---

## هەکه بوێرم

هەکه بوێرم
بەرەبەیتا خوه دێ ڤەکم

پرچا کەدەر تێ هەرزی

د شین و بەهیادە دێ شەکم

باوەرکه ئەز هەکه بوێرم

بۆ زەڤیا تێنێ گڤاشتی

بۆ لاوینیا خەمێ دزی

نەی بێخێرم . نەی بێخێرم

هەکه بوێرم
سەرڤە ئەلماس ،

ناڤ زل زێرم

دێ شێم بارخانەکا کولا

دێ شێم بێ زادە رەش دلا

د نێڤ لەپادە بکـە ئاوار

ژ ئاشی چێتر ئەزێ هێرم
ئەزێ هێرم

1983/11/26

# دەربەدەری

هەمزە عەلی
سلیمانی

○

هەمو ڕۆژێ لەبێ دەنگی ئەخۆمەوەو
هەر بێدەنگم
ئەی تۆگیانە ؟
بۆبێ دەنگیو ...
لەبێ دەنگیت ناخۆیتەوە
لەجێگای خۆت بۆ ناجولێی ؟
بەرەو بیابانی خەم برۆو ..
باسی شەو بۆ ئێمە بکە
تۆ ئەتوانی بچێتە سەر چاوەی خواروو
ئاو بۆتینوکان بهێنی ؟
ئاو هێنان خۆ زۆر ئاسانە
ئەی بۆ سەر چاوەت لێ ئەگرن
هەموو شەوێ گوێ لەوچیرۆکانە بگرە
کەچۆن ئاو لەمرۆڤ ئەگرن
ئەی تۆ بەبێ ئاو ناخنکێی
ئەی تۆ بێ گر سەرمات نابێ ؟
ئەو دارانەی کەڕەشەبا لێیان ئەدا
وورده وورده کەلاکانی لەناو ئەبا

ڕەشەباداری تەڕناخا
تۆ نازانی مرۆڤ چی‌یە ؟
لەڕابووردو نوستوە .. یا لەدرگا دانیشتووە
ناوی خۆت قەت ئەزڕێنی
تەنیا گوێ لەدەریابگرە
خۆت ئەزانی تەور سەری مرۆڤ ئەبڕێ
.. .. ..

دەر یالەدەریا تێ‌ناگا
ئەی تۆ چۆن ئاواتێ ئەگەی
ئەی من چۆن لەتۆ تێ‌ئەگەم
تۆ هەنگاوی دەربەدەری بۆ کوێ ئەنێی
ئەی نازانی دلداری مانای مردنە
خەو هەنگاوی خەساندنە
لەناوەوە تۆ بەرەو پیری خەم برۆ ئەی کێ لێرەبێ
خەم ئەمرێ زمانی سەربەستی خوێنە ئەی تۆ چۆن
لەخوێنا ناژیت خوێن ئاشتی‌یە ئاشتی بەبێ تفەنگ
ئەمرێ خوێن تفەنگە تفەنگ بەبێ ئاشتی ئەمرێ

# ژین و ئازار

●

اسماعیل حسین رەڤەندی

چاڤ نا خەون
برینێت من
ب چ دەرمانا ... ناکەون
لەوڕا هەردەم
ڕۆژو ڕوناهی ل من شەڤن
دەردو ئێشا
خو بو سەر دلێ من کێشا
ژ هەمی لا
کەڤتم بەر ئێریشێت کولا
خوشی و شادی

ژهەر چار ڕەخا ژمن دڕەڤن
ڕێك و دراڤ
تژی تەلهن ... تژی داڤن
ناهێلن شاهی من هەبن
ئازار سێ ڕێز
ب خەبات و هێز
بوونە کئورکێت ژینا من
ل پێشیا من
بوونە دوژمن بوونە تەڤن
* *



بەندبێژێکی ئەڵەمانی ڕۆمانتیک

# هاینریش هاینە

# 1797 — 1856

## هاینێ و هەڵبەست

هاینێ ، پتر بە «لیریک بێژ» نەک بوێژ دەژمێردرێ . لیریک Lyric وشەیەکی لاتینی‌یە بە واتای هەڵبەستەکی سادەو ساکار دێ کە داندرابێ بۆ ئەوەی بەدەنگ بگوترێت . زۆربەی لیریک ، لەبەر ئەوە ، شێوەیەکی فۆلکلۆرانەی پێ وەیە ، کێش و سەروایان وەک هی شیعرێکی ڕێک‌وپێک دروست نین ، لەوانەیە ، لە چوارینەکدا، تەنها جووتەک سەروادار بن ، جووتەکەی تریان نا ؛ یان لە هەمان چوارین دێڕەک لەوی کە درێژترەو هەمان موزیکەی نی‌یە . لێرەدا پیاو دەتوانێ ، تارادەیەک ، «بەیت»و «بەند» و «بەلۆرێ»ی کوردەواری خۆمان بە «لیریک» دابنێ . ئەوەندە هەیە کە لیریکی ئەوروپای ئێستا ـ یان باشترە بڵێین ئەوروپای پاش ڕێنێسانس ـ Renaissance ـ دانەرەکەی دیارە هەرچی «بەیت» و «بەند» و «بەلۆرێ»ی کوردی‌یە دانەرەکانیان نەناسن . ئەوەش هەیە کە هەمان لیریکی ئەوروپایی لە سەردەمی ڕۆمان و یۆنانی‌یە ئەنتیکەکاندا ، دانەری نەناسراویان هەبوە . وشەی «لۆراندن» ، کە کرمانجەکانی ژووروو زۆر جار بۆ گۆرانی و سترانی بەکاردێنن ، ئەمیشیان ، تا ڕادەیەک لە وشەی لیریک Lyric ەوە نزیکە .

بابەتەکانی لیریک پڕن بە ئەویندار ی و دڵی شکاو و جەرگی بڕاو و قارەمانەتیش . شێوازی دەربڕینی ئەو هەستانەش تۆزێ زیاد لە پێویست ئاگرین و بەسۆزە .

جا ، سەبارەت بەو ساغ‌بوونەوانە ، پیاو نابێ شیعری هاینێ بەراورد بکا لە گەڵ شیعری شاعیرە گەورەکانی ڕۆمانتیزمی ئەڵەمانیا وەک گۆتەو شیلەرو ئایشندۆرف و نۆڤالیس و مۆریکەو زۆری‌تر ، هەرچەندە کە هاینێ بە گەورەترین لیریک بێژی ئەڵەمان دادەندرێ .

ئەم هەڵبەستانەی لەبەر دەستمانن هەڵبژاردەیەکن لەو لیریکانەی هاینێ . وەک زۆر لیریک ، ئەمانەیش بریتین لە چەند کەرتەک ـ «ستانزا ـ Stanza» کە پەیوەستی‌یەکی ئەوتۆیان لە نێواندا نی‌یە ، لەبەر ئەوە پیاو دەتوانێ بە ئارەزووی خۆی چەند ستانزایەک هەڵبژێرێ و ئەوانی‌کە بخاتە پشت گوێ ؛ یان پاش و پێشیان خا بێ ئەوەی واتایان تێک بچێ .

من ، کە لە ساڵی 1961 لە پاریس دەمخوێند ، کچە ئەڵەمانەکی ئاشنام کۆمەڵەک لەو لیریکانەی هاینێ‌ی بۆ ناردم کە بەدەست چاپی کردبوون . لە پاشاندا ، خۆیشم دیوانەکی شاعیرم کڕی و سەیرم کرد پاش و پێش هەیە لە نێوان

ستانزاکانی هەردووکان و کچە تەنها بەشەکی بۆ ناردووم لەو بیریکە دریژەی هاینێ کە خۆی لە 65 ستانزان پێکهاتوە .

جا منیش ، لەم و لەو ، هەستام ئەم کۆمەڵەم هەڵبژارد کە ، پێموایە ، چێژو بۆیەکی تەواوی بەندو بەستەو شیعری کوردی و ڕۆژهەڵاتی یان پێوەیە .

هەر وەك دەبیبنن ، ژمارەی دێری ستانزاکان جیاوازی یان هەیە لە گەڵ ئەوی تر – 8 و 12 و 16 یان تێدایە . هاینێ لەوە زۆر پتریشی هەیە . کە هاینێ جۆش و خرۆش و سەنتیمەنتالیزمەکی ئا بەم چەشنە هەڵڕێژێ ، جێی خۆیەتی موزیکارە ڕۆمانتیکەکانی ناوداری ئەڵەمانیاو ئۆتریش وەك شوبەرت ، شومان ، براهمز زۆریان لەو هۆنراوانە کردبێتە «لید – Lied» کە ئەمیشیان جۆرەکە لە گۆرانی ڕۆمانتیکی زمانی ئەڵەمانی و ، کە پیاو ناتوانێ پێی بڵێ «گۆرانی» بەڵکو هەر دەبێ بە «لید» ناو بنرێ . هەروەك لە کوردیش دا بە «حەیران» و «لاوك» ناگوترێ گۆرانی ، ئەویش وایە . خۆی ئەمانە بەڕاستی جیاوازیان هەیە لەگەڵ ئەو گۆرانیانەی کە هەموو ڕۆژ گوێمان لێ دەبن .

هاینێ ، ئەم هەڵبەستانەی والەبەر دەستمانن ، لە دەوروبەری تەمەنی 20 – 23 ساڵی دا نووسیون ؛ هی واش هەیە کە بە 16 ساڵی نووسیویە .

کە تۆزێ بە ناو ساڵدا چوو ، شیعرەکانی گەیشتووتر و پتر لە شیعری ڕێك و پێکیان دەکرد .

هاینریش هاینێ بە ئاخرین شاعیری سەردەمی ڕۆمانتیزمی ئەڵەمانی دادەندرێ . کاروان سەرابوو لە نێوان بەسەرچوونی قۆناخی سەنتیمەنتالیزم و دەست پێکردنی قۆناخی ڕیالیزم ، ئەو کاروان سەرایەی کە بە ئەڵەمانی پێی دەڵێن Spaet Romantik واتا «دوا دواییەکەی ڕۆمانتیزم» . بۆیەکا ، بۆنی ماڵاوایی و نۆستالجیای لێدێ .

هاینریش هاینێ لە ڕۆژی 1797/12/13 ، لە شاری دوسلدۆرفی ئەڵەمانی ، لە دایك بووە . ویستویە ، وەك باوکی ، ببێتە بازرگان بەڵام سەرکەوتوو نەبووەو چووەتە کۆلێژی (ڕەوا – حقوق) . لە ساڵی 1831دا باری کرد بۆ پاریس و هەتا مرد هەر لەوێ مایەوە .

جگە لە هۆنراودانان ، هاینێ بە ڕۆژنامەوانی خەریك بووەو کۆمەڵەك نووسینی لەسەر باری کۆمەڵایەتی و سیاسی و فیلۆسۆفیکی ئەوساکە هەیە . دەردەکی گران لە 6 ، 7 ساڵی دوایی ، ژیانی لێ تاڵ کردو لە ماڵەوەی بێخست تا لە ڕۆژی 1856/2/17دا سەری نایەوە .

چەند خۆشە کە لە مانگی گوڵاندا
خونچە گوڵ لە باخ دەگەشێتەوە
ئەوسا ئەڤینی ش دیسان دێتەوە
چزووی لە دڵدا دەبوژێتەوە
چەند خۆشە کە لە مانگی گوڵاندا
جریوەی مەلان دەزرینگێتەوە
دڵەش لێیان بە .. وەڵام دێتەوە
چیرۆکەکەی خۆی دەگێڕێتەوە



هەر کە چاوەکەی مەستت هەڵدێنی
ناخۆشی ی دڵم هەڵدەتەکێنی
خۆ ئەگەر هاچ کەم ئەو دوو لێوانە
بکەونە دەستم ئەو دوو سێوانە
سەر باوێمە سەر سینەت گیانەکەم
پێم بڵێی کورە ! – حەزت لێ دەکەم
ئەوسا مووچڕکی خۆشەویستی پێم
دادێ و لە خۆشیان هۆڕ هۆڕ دەگریێم



دارچنارێك وا لە باکوور دیارە
بە تاکی تەنیا ، لەسەر گردی ڕووت
بە بەفرو سەهۆڵ چەند گرانبارە !
پشتی چەماوە ئەو داری پەڕپووت

خەو دەبینێ بە پیرە دارخورمە
کەوا ، زۆر دوور ، لەو خاوەر زەمینە
بە تەنیاو بێ دەنگ لەو دەشتە گەرمە
بێزارو وەڕس لەو جۆرە ژینە

●

گوڵ بۆ ئاوا بێڕەنگە ؟
کیژۆڵە لێو بەبارە
وەنەوشە بۆ بێدەنگە ؟
لە ناو ئەو چەمەنزارە

قومری بۆچ دەکا ناڵە ؟
لە تاقی ئاسمانا
قەت بووە بۆن تەپاڵە
لە داری ئەرخەوانا ! ؟

بۆچ بێ تینە ئەو خۆرە
لەم سەر زەمینو ئاوە ؟
بۆچ ڕەنگی خاك وابۆرە
چۆڵەو بوویتە کەلاوە ؟

ئای لە خۆم چارە ڕەشێ !!
بۆچ ئەوهام لێ قەوماوە ؟
خۆشەویستەکەم دەشێ
ئەمنت ئەوها داناوە ! ؟

خۆ تۆ جوانتری لە گوڵ
پەمەیی ڕەنگو روخسار
کە دەتبینم غەمی دل
دەکشێ بۆ ژوور بەرەوخوار

هیوای دڵم ئەوەیە
دەخوازم لە خودای تاك
بتهێڵێ بەم نەشئەیە
واجوانو گەشو پووپاك

●

وادێنەوە بەر چاوم
کۆنە دیمەنی کەژ ان
کە دەنگت دێ ، هەناوم
بەجارێ دێتە هەژان

پێم مەڵێ ، تۆم خۆش دەوێ !
دەزانم دوو شتی جوان :
بەهارو بەزمی شەوێ
شەرمەزارن لە تاوان

پێم مەڵێ ، تۆم خۆش دەوێ !
هەر ماچم کە بە کڕی
ژیکەڵێ لە منت کەوێ ،
گوڵ وایەخەی دادڕی

●

خۆ لە مێژە بیستوومە
کە تۆش ئەمنت خۆش دەوێ
بەلام واپێت گوتوومە ،
ئیتر خەو لێم ناکەوێ

چوومە سەر لووتکەی چیایێ
دەستم درێژکرد بۆ حەوا ،
چوومە کەنار دەریایێ
گریام لە گەڵ ڕۆژئاوا

دڵم خۆرە ، ببیبینی ،
ئەوها گەرمو پڕشنگدار
کە لە دەریای ئەڤینی
نوقم دەبێ بە یەکجار

●

دەچمە سەر لووتکەی چیایێ
دەبمە غەریبو غەمبار

خوا دوو باڵی بدایێ
دەفڕیم بۆ لات هەزار جار

بریا بە بریای خوایێ
پەڕەسێلکەبام لە لات
هێلانەم بکردبایێ
بەرامبەر بەژنو باڵات

بریا بە بریای خوایێ
بولبولبام لە ناو داران
بەشەو بمخوێندبایێ
لەبەر پەنجەرەی یاران

●

شیعری من گشتی تاڵە ـ
ئەی دەبێ چۆن بێ گوایە !
خۆت بوت نەکردمە پیاڵە ـ
ژاراو وا لە خوێنمایە !

شیعری من گشتی تاڵە ـ
ئەی دەبێ چۆن بێ گوایە !
دڵ بۆیێ دەکا ناڵە ـ
ماری وەك تۆی تێدایە .

●

لەخەو دەگریام شەوێ
لام وابوو مردووی ـ یارێ !
هەر کە ڕابووم لە خەوێ ،
فرمێسك دەهاتنە خوارێ !

لەخەو دەگریام شەوێ
لامو وابوو لێم تۆراوی
هەرکە ڕابووم لە خەوێ ،
چاو هێشتا فرمێسکاوی !

لەخەو دەگریام شەوێ
لام وابوو بووین بە هاوژین
هەرکە ڕابووم لە خەوێ ،
کەوتمە لە خۆدانو شین !!

●

خاك لەمێژبوو قرچۆكبوو[1]
جۆزەردان تێی هێناوە
گشت شت کەوتنە هاتوچوو
هەر دڵم بێ بەش ماوە

گوڵ پێکەنین ، مەل جووکان
زەنگوڵ دەنگی دایەوە[2]
کیژۆڵە ئێسك سووکان
دڵیان پێ نەکرایەوە

●

(1) مەبەس لە قرچۆکی خاك ، لێرەدا ، وەرزی زستانە .
(2) مەبەس زەنگوڵی ملی ئاژەڵە کە ئیتر لەو مانگەدا دەستپێدەکەن ، بۆ چێرینێ ، بەرەو چیایان هەڵکشێن .

سەرچاوە :

بە ئەڵەمانی

1) Heinrich Heine

Buch der Lieder

2) Johannes von Guenther

Lyrik aus aller Welt Liebesgedichte




ئەحمەد قادر سەعید

# سەگ و تەنیایی

كه له ماڵێ هاتمه دەرێ ، شەوێكی تاریك و ئەنگوستە چاوبوو ، تۆف ، شەستەباران وەك كوندەی سەر بەرەوژێر دەهاتە خوارێ ، گڵۆپی سەر شەقامەكان وەك فیشەكدانی مامەشانیان لێهاتبوو ، نیوە نیوە نەبێ هەڵنەبیوون . ئەمدەزانی بەرەو كوێ ملی رێگەم گرتووە ، ئەوەندە نەبێ تەنیایی لە ماڵەوە بێزاری كردبووم ، باكم نەبوو پاش ماوەیەكی دیكە هێندە تەڕ دەبەم ، دەبمە جلە سەگ و خۆم بۆ هەڵناگیرێ و جلەكانم ناتوانم .. ویستم بگەڕێمەوە ، تەقەم لە دەرگای حەوشە هەستاند ، بێسوود بوو كەسێك نەبوو بیكاتەوە ، بۆیە بە راستە شەقامەكەدا بەرەو كۆڵانە تەنگەكەی دەكەوتەوە سەر رێگا سێ رێیانەكە ملم پێوەنا ، دەمویست بەرەو رۆخی رووبارەكەی قەراغ شار بڕۆم ، خۆشم نەمزانی بۆ لەناوەراستی ئەو سێ رێیانەدا چەقیم ، چەخماخەی كەواڵە هەورێكی رەش تارمایی دیمەنێكی سەیری نیشاندام بەخۆمدا هاتمەوە ، پێموابوو كات لەوە بەدەرە ئادەمیزادێكی ئاسایی لەو شەوە دەیجوورەدا لە دەرەوەبێت . بەرەو پێشەوە هەنگاوم هەڵێنایەوە .. ئێستا زانیم من كارێك سەری خۆزگەی پێ هەڵگرتووم لە پەراوێزیدا ژیان بەسەر دەبەم ، ئومێد لە هەوارگەیدا دەچنمەوە ، هەر بۆیەش بەلامەوە مەبەست نەبوو كەسانی نەگریس بڵێن دەركراوە ، یان وەك شێتی سەر شەقامان ئالودەی تەنیایی یەو لە گوللەی وێڵیش سڵ ناكاتەوە ، ناسڵەمێمەوە تا چاوم لە دوورەوە دیدەی مەستی «ئامان» رانەمووسێ ، ئەوكاتە فەرامۆشی ئەشكەنجەی ساڵانی دێرین دێت . تارمایی بوو بە ماخۆلیان و گیان و لەشمی تەنی ، دەمارەكانم گرژبوون ، هۆشمی لە جیهانی ئاسایی هێنایە دەرێ ، بەبێ ئاگا كۆڵانە تەنگەكە تێكیەوە پێچام . هەستمكرد وا بەتەواوی تەڕبووم ، ئاو لەسەر و پۆتەڵاكم دەچۆڕێتەوە ، جلەكانی بەرم گرانبوون ، بۆیە بە ئەستەم هەنگاوم بۆ هەڵدەهاتەوە . گرانی هەنگاو و جیهانی تارمایی یادێكی دێرینی خستە سەر سفرەی ڕاخراوی دەروون .. یاد بوو بە دیمەنێكی لێڵ ، ئینجا ڕۆون ، روونتر هاتە پێشەوەو كەوتە سەما ، سەمایەكی هێمن وەك هێمنی بارانی ساڵێكی پەڵە دواكەوتوو . تاكە عەمودی ئەو ناوە نقوومی ناو رووناكیەكی تلخی كردم ، تا لە گەڵ یاددا دەستمان گرت و ئاوازی چۆراوگەی گوێسوانەكان چاوی پێ لێك نام :

«خۆت سەرەتای ئەوینێكی ئاڵبووی و گوتت ، تۆ پەیامی دڵی ژانگرتوومی ، لەدوو توویی پەرەكانیدا هەتوانی بڕینی چەند ساڵەمت پێیە لێیم بێبەش مەكە .. با بڕێك دەردم سووك بێ و هەناسەی بەتوكەیشتن هەڵكێشم . تۆ سەرگوزشتەی خۆشەویستی یەكی رەسەنی ، لەپێناویدا دەسووتێم ، دڵت دەكەمە دوائارامگاو هێلانەی بوونمی لێدروست دەكەم ، خەوی سەرخۆشیمی بە ئاسوودەیی لێدەشكێنم تۆ تاسەی دوا هەناسەی ژیانمی .. ئاوات لە بووندا دێتە دی ئەكەی دەروازەی فەرامۆشی لەسەر داخەی ..»

«دەمم بە گەردنی نامەتەوەنا ، تێر بەرامەی ئەوساتەییم مژی خەوێكی تاسبردوو بردمیەوە ، هەر لەو كاتەوە پابەندی هەمیشە توندی كردوتە پێم و لە پێناوی ئەودا هەناسە دەدەم ، بەو شێوەیەی لە فەرهەنگی تۆماری ئەودا دەرگای هاتنە دەرەوەم لەسەر كڵۆم دراوە بۆیە بەندم تا نهێنیەكان رەها نەكەم»

باران دەستی سەماكردنمی شلكرد ، چاوم بەدەوری خۆمدا گێرایەوە . هەنگاو بەرەو كام جێگا هەڵێنمەوە ؟ خۆشم دەركم نەدەكرد ، هێندە لەشم تەڕبووە وەك لە حەوزێك ئاو

هەڵکێشرابم . هەورەکان بەهاری ئاسا دیسانەوە چەخماخەیاندا ، لە نێو بروسکاندا تارمایییەکەم روونتردیت ، ترسێکی ناوەخت لەشمی لە ئامێزنا ، تا دەهات زیاتر دەترسام .. بە شێوەیەکی وەها کەم جاران شتیوام بەسەردا هاتووە .

هێزم هێنایەوە بەرخۆم بە دڵخۆشی دانەوە دەمگوت : مرەنگە ئەوەش کەسێکی وەك من سەرلێشێواو و سەرگەردانی ناو دنیای عیشق بووبێتو پێوەندیان لە گەردنی ئەوینی کردبێت .»

زیاتر چاوم کردەوە ، ماوەیەك هەڵگلۆفین ، بەو نیازەی تارمایییەکە روونتر ببینمو چیدی لەناو ئاوی باراندا شەلال نەبم ، بێسوودبوو ئەویان لەبەردەمم گەورەتر دەبوو ، بە شێوەیەکیوا هەستم دەکرد ، کە دێت ، ڕەنگە مێزم لێدات ، لەقوڕاوەکەم وەرداو دەست بخاتە بینمەوەو بمخنکێنێ . چەند جاران ویستم هاوارکەم تاکەسێك فریام بکەوێو لەو مۆتەکەی مەرگە رزگارمبکاتو لەو دەریای بیری پەرتەم هاوێ . بەلام ئەوەم نەکرد ، هاوارکردنم بە بەزین دەزانی بۆیە بڕیارمدا ئەو گرێ کوێرەیە بکەمەوە ..

کزە بایەکی سارد هۆشی هێنایەوە بەرمو سەرمایەکی بەهێز زایە لەشمەوە وەك سوژن بە لەشمدا بکەن ددانم یەکدی نەدەگرت ، چەقچۆم گەیشتێ ، خۆم سەیر دەهاتە بەرچاو ، من ئەوهاو کەسانی دیکەش دەناسم لە ئامێزی گەرمدا لە ڕەتبوونی کات بێزارن ، دەیانەوێ شەو ڕاگرن . گەلێك جارانیش «ئامان» ئەو قسانەی بە گیێ مندا دەچرپاندو مەزەی دەبزواندم ، منیش سەری ڕەزامەیم بۆ دەلەقاندو لە سەرەخۆ چاوم بۆلێك دەنا . نەمدەزانی من هەر هێندەم ، تەلاری ئەوینم بە پشووە بایەکی تەماوی هەرەس دەهێنێ لەناو دەفتەری لەبیرچوونەوەدا ناوم دەنووسرێو بە هێڵێکی ڕەش نیشانە دەکرێ .

چۆڕاوگەکان دیسانەوە بوونەوە سیمفۆنیایەکی لەسەرەخۆ ، ووردە ووردە هەنگاوم هەڵێنایەوە ، بەرەو قوڵایی تاریکی ڕۆیشتم ، تا یەکەم جار هیچ نەبینم چاوم نووقاند ، کەچی لەو دیوی پەردەی ڕوانینەوە کۆتری خەیاڵ بۆ ناو هێلانەی باوەشی «ئامان» لە شەقەی باڵیدا :

«ئامان گیان ، شۆخی نازدار ، گەردن کێل ، لە ئەوینی تۆدا تواومەتەوە ، پەیمانمان پێکدا شارێی ژیان بکەینە ڕوانگەی پێك هێنانی بەختیاری ، نمونەی خۆشەویستی سەردەمبین ، مەبەستی پیرۆزو کارو کامەرانی بچێنین ، دامێنی خاك بەرنەدەین ، بەلام بێ وەچەیی یەکەم مۆتەکەی نەگریسی شێواندنی گوزەراندنمانبوو .. لەبری گوڵاڵەی بۆنخۆش دڕكو داڵم هاتنە ڕێ ، ئاسوودەییم شێوا ، بوومە کەسێکی دی ، گۆڕام ، خۆم هۆی سەرەکی ئەو گۆڕانە نەبووم .»

خزیم ، هەنگاوێك ، دوان ، سیان ، لە چوارەمدا نەمتوانی هیچی دی بڕۆم ، لە بان بەردێکی تەختی پاڵ دیوارەکە دانیشتم .. باران خۆشی کردبووە چۆڕاوگەکان ترپەیان کەمببوو . هێمنی ، بێدەنگیەکی کاتی بوو باڵی بەسەر شاردا کێشابوو . چاوم بڕیە نزیکترین خاڵی بەردەمم ، هەرزوو ئێستا بە تەواوی پشووم نەدابوو پێڵوەکانم گرانبوون ، سەرم خستە ناو لەپی دەستمەوە ، بیرەکانم لێك ترازان ، بە هێوور بوونەوەی بڕێك ئازاری لەشم جارێکی دی «ئامان» لەسەر شانۆی تاریکی یاددا دەرکەوتەوە ، «لەماڵەوە دەستەو ئەژنۆ پشتی بەدیوارەوە داوە ، سەرەتای بەهاری تەمەنی لێبووە بە پایزو گەڵا زەردە بابردووەکانی دەژمارد ، کە چاری پێکەوتەم ئاهێکی قووڵ لە دەروونیدا هاتە دەرێ .. لەگەڵ خۆی دەدوا ، دەستێکم خستە سەرشانی ، سکالای بێ هیواییم لە بەردەمیدا دانا ، نەمدەویست تەما بڕاویشی بکەم ، ئەو بەقسە هاتو بێ دەنگی ئەو کاتەی واهەژاند :

- ئەدی ئەتۆ نەتدی ؟
- چی ؟
- هەیهو ، هەر مەیبینە ، چاوت ئەو شتانە ناخوێنێتەوە ..
- دەبڵێ بزانم چی‌یە ، بەڵکو دیبێتم ؟
- نا هەر مەیبینە .

هەستا ، ڕووی لێوەرگێڕام ، گوێم لێبوو لەگەڵ خۆی دەدواو دەیگوت :

«بیست ساڵ چاوەڕوانی ماوەیەکی کوشندەیە ، خۆ هەر بە دەساڵیش یەکێکم بووایە ئێستا دوانم دەبوو ، لەسەرو پێم زیادبوو ، ئای ووشەی دایکایەتی چەندە مەزنی ، منداڵ لە ئامێزگرتن چێژێکی ئەفسوناوی دەبەخشێ .. تاکەی منیان لێ بێبەش دەبم»

دەستم ماندووبوو ، نەرمەبای دواباران ، تیری ڕوانینی ئاراستەی تارمایی بەردەمم دەکرد ، دەستەکانم تەزیبوون ، موچرکەیان پێدا دەهات ، غوربەتیم هەڵیستاندمە سەرپێ ، تەزووی سەرما دەمارەکانی گرژکردبووم ، ڕۆیشتم تارمایی کەوتە جووڵە ، یەکەمجاربوو تێبگەم ئەوەی بەردەمم گیان لەبەرێکەو ئەو لاپەسیوەش ئارامگایەتی ، هەنگاوم بەرەو ڕووی نا ، زیاتر سەری بەرزکردەوەو لە دوایشدا بە هێواشی بێ گوێدانە ئەوەی کەسێك دەیەوێ لێی نزیك بێتەوە ، خۆی هێنایەوە یەك و لەشی گرمۆڵە کردەوە ئێستا پشکۆی یادێکی سرتر لەشی داغ کردم ، برینی بەسوێی لێم هاتەوە ژان ، پەپولەی ئەوینی فرێنراوم لە ڕووناکی دابڕا ئەو قسانەی بۆ بەجێ هێشتم :

«ئەو کاتەی خۆشتویستم منداڵ نەبووم ، هەوارگەی چۆڵتم دەزانی ، دەشمزانی ڕێگا هەورازو نشێوە ، دەرگای دڵم لەبەر دەمتدا ئاوەڵەکردەوە ، باغی ئەوینم بە فرمێسکان پاراوکرد ، پەروەردەمکردو تۆش گەورەیی مەبەستی پیرۆزت پێناساندم .. لەبەر تریفەی مانگەشەویدا هەمیشە وەك مۆم دەتوێمەوە .. بەجێم مەهێڵە»

کە وەئاگا هاتمەوە نزیك ببوومەوە ، ترسم ڕەوییەوە ، کە ئەویش زانی هەستا لە گەڵیدا چەند شتێکی دیکەش هەستان ، کەوتمە تێرامانیان ، ماوەیەك لەسەر چیچکان هەڵتروشکام . یادەکان تێکرا بوونە ڕەوە قوڵنگی کۆچەری و لە شەوێکی تایکدا کۆچیانکرد ، تەنیاییان خستە باوەشی ساردمەوە . تەماشای دەورو بەری خۆم کرد تێگەیشتم شەو ڕاشکاوە . بەرەو ماڵەوە کوڵانەکەم بەجێ هێشت ، پشتم لە ڕووباری قەراغ شارکرد ، تەواو نەبزوتبووم هەستی خشپەی شتێك لە دواوەم سەرنجی کۆکردەوە ، ئاوڕم دایەوە ، سەگێك و دوو توتکە لە دوامەوە هەنگاوەکانم تێك دەکەنەوەو دێن . نەمویست لە خۆمیان دوور بخەمەوە . هاتم ، هاتن دەرگای ڕەشە خانووەکەم بە پاڵێکی توند کردەوە ، چوومە ژوورەوە ئەوانیش بە بێ سڵەمینەوە لە گەڵ من خۆیان پێداکرد ، هەناسەیەکی ئاسوودەییم هەڵکێشا ، دڵخۆش بووم لە هاتنەوەی ئەو جارەمدا تەنیانیم بۆیە بڕیارمدا ئەوانە هاوەڵم بن و «ئامان» یش دوا هەواری بێ یادی بێ ...

**بیری ئەم چیرۆکە لە فۆلکلۆری کوردییەوە وەرگیراوە**

# کۆنەهەوار

پیرە کەڵەشێر بە بێ وزەییەوە باڵەکانی بەیەکدادا ، ئەمجا بەڕوویەکی کزەوە چاوێکی بە دەورو بەری خۆیدا گێڕاو ، کەوتە ورتە ورت :

( ـ ئای زەمانە چیت لە ژێرسەردایە !؟. تا ڕۆژێك بوو ئەم هەوارە چ جۆرە ژیانێکی تێدابوو ؟!.

ئەو دەمە من لە هەرەتی لاوێتی دابووم ، بەیانیان زوو بەر لە هەموو گیاندارێکی تر لە خەو رادەپەڕیم ، قەڵەمبازێکم دەدایە سەر بانێژەکە ، بەو پەڕی شادییەوە ، وەك گەردی خەو لە خۆم داتەکێنم باڵەکانم بەیەکدا دەدا ، ئەنجا پڕ بە خۆم دەنگم لێ هەڵدەبڕی ، دەمخوێند ، ئای چەند بەختەوەربووم !، ئەوی ڕاستی بێت ئەو دەمە بەلامەوە وابوو کە تاکە دەنگ خۆشی ئەم هەوارەمو ، گشت بەیانیانێك لە تەك تیپی مۆسیقای سروشتدا دەچریکێنم !.

ئای زەمانە !. ئێستەش پیرو خەرۆبووم ، لەم کونە هەوارەدا جێماوم ، خەریکە برسێتیو ، تینوویتی پرزەم لێ دەبڕێت !! .)

خواستی ئەوەبوو هەروا بە یادی جارانەوە لە شوێنی خۆی جووڵەی بۆ نەکات ، بەڵام برسێتی جووڵاندی ، کەوتە گەڕان ، هەر گەڕا ، چاوی دەگێڕا ، تا لە پەنا وشکە کەڵەکێکی داروخاودا پیرە تانجییەکی بەدیکرد ، بە شادییەوە خۆی گەیاندێ ، کە ناسییەوە بە ڕوویەکی خەمناکەوە لەبەر خۆیەوە کەوتەوە ورتە ورت :

( ـ ئای زەمانە چیت لە ژێر سەرایە !؟.. مرۆ تابمێنێ سەدان شتی دژ بە یەك دەبینێ ! .. سەیرکە ئەمە تانجییە ڕەشی خۆمانە ، خەریکبوو نەیناسمەوە . بڕوانە چۆن پیرو خەرۆ بووە ! سەری لە گوێ قەبر دەلەرزێت ، ئای بەستەزمان ! .. تارۆژێك بوو کوژەکەی شینیان لە مل کردبوویت ، جلی جوانیان بە پشتدا دابوو ، بەڵام ئێستاکە ، دیارە تۆش وەك من بێزراویت ، بۆیە واڵەم کۆنە هەوارەدا جێیان هێشتووین !.)

ئای زەمانە .. تانجی‌یە قوتەی نێو هەوارەکەی خۆمان چاکم لەبیرە .. لە هەموو راوێکدا چۆن دەستی خۆت -مۆشاند ؟!. چ نێچیرێکت لە گەڵ خۆتدا دەهێنایەوە ؟. هەموو ـ وچی‌یەکیش ئاواتەخوازی ئەوەبوو تانجی‌یەکی وەك تۆی هەبوایە !! .) لە پیرە تانجی چووە پێشەوەو ، سڵاوێکی ێکرد . پیرە تانجی وەك دەمێك بێت بە هیوای ئەوەبێت . لەم کۆنە هەوارەدا چاوی بە کەسێك بکەوێ و ، هیچ نەبێ دوو قسەی لەگەڵدا بکات ، تا کەمێك وەرسی و تەنیاییەکەی بەبادات !. بۆیە هەر زوو بەو پەری خۆشی‌یەوە وەڵامی پیرە کەڵەشێری دایەوە .

- سەرچاوم هاتی مام کەڵەشێر ، بە دیتنت پێخۆشحاڵم ، توخوا چۆنی ؟، حاڵ و ئەحواڵت چۆنە ؟!.

- سوپاست دەکەم برای دڵسۆزم ، وا جاری ماوین بۆ دەردو ڕووخاوی ئەم رۆژە رەشەی تێی کەوتووین ، با دەردی پیرێتیش لەولاوە بوەستێ ، بەڕاستی کە پیاو پیربوو دەبێتە مەخسەرە ! .

- هەروایە .: بەخوا قسەتە ، کە پیاو پیربوو بۆ مردن چاکە !! بەلام دەڵێی چی ژیان هێندە خۆشەویستە پیاو دەستی ناچێتە خۆی !. ئای زەمانە .. رووت رەشبێ ، مام کەڵەشێر لەبیرتە کاتی خۆی چۆن بووین ؟!. تۆ کەڵەشێرە کەردن زێرینەی نێو هەوارو ، منیش چ گروگفێکم هەبوو ؟ . پیرە کەڵەشێر چاوەکانی نووقاند ، وەك بیەوێ کەمێك لەو دیمەنە تاڵەی دەورو بەری دوور کەوێتەوە ، بەلام پیرە تانجی هێنایەوە نێو دنیاکەی خۆیان بەوەی بە گەش بینی‌یەوە پێ ی وت :

- تازە ئەوەی چوو ناگەرێتەوە ، گرنگ ئەوەیە ئێستاکە بیرێك لە حاڵی خۆمان بکەینەوەو ، مشوورێکی خۆمان بخۆین !. تا لەبرسا نەمردووین !.

پیرە کەڵەشێر راست بووەوەو ، قنچ و قیت وەك بەرگی پیرێتی‌و ، کەساسی فرێ دابێت ، وتی :

- منیش هەروا دەڵێم .. ئەوەی بە دوو کەس دەکرێت ، بە تاکە کەسێك ناکرێت ، نابێ ئەوەش لەبیرکەین ، بەراست دوو پیرە مێردی وەك من و تۆ چیمان پێ دەکرێت ؟!.

پیرە تانجی هەر بە گەش بینی‌یەکەی خۆیەوە لەسەری رۆیشت :

- بێ قەزابی .. مام کەڵەشێر ، یەکجار وا ورە بەرمەدە ، تۆ بڵێی بەو هەموو دنیا دیتنەی خۆمان و ، ئەزموونەمانەوە نەتوانین تەنها نێچیرێکیش بخەینە داومانەوە !.

- ئاخر .. نەمن دەنگەکەی جارانم ماوەو ، نەتۆش بەهێزی و ، تیژرەوی‌یەکەت ماوە !.

- ئەی خۆ هێشتا نەخەڵەفاوین ؟.. خۆ ئەتوانین بیرێك لە حاڵی خۆمان بکەینەوە ! .. ئەی نازانی تێفکرینی چاك مل دەیان دەنگی بە سوزو ، هێز دەشکێنێت ؟!.

پیرە کەڵەشێر زیاتر گەشایەوە ، وەك بە پیرە تانجی بڵێ : ( ـ ها باوکم ئەوا من لە ئێستەوە بیرێك لە مەسەلەکە دەکەمەوە ! .) سەری بۆ نەوی‌کردو ، بێدەنگ کەوتە بیر کردنەوە .

پیرە تانجیش سەری بۆ کەلاخست .

دوای کەمێك پیرە کەڵەشێر رووی کردە تانجی .

- برا شتێکم بە بیردا هاتووە .

- ئادەی بزانم چی‌یە ؟!.

- دەڵێم بابەناوی ئاوەدان‌کردنەوەی ئەم کۆنە هەوارەوە شتێك بکەین !.

- بڵێ بزانم چی بکەین ؟!.

- من دەچمە سەر ئەو کەڵەکە بەردەو ، دەخوێنم ، هەرچی نێچیرێك بە پیر دەنگەکەمەوە هات تۆ بیگرە !.

- بەڕاستی مام کەڵەشێر ئەمە بیرێکی زۆر چاکە ، بەلام ..

- بەلام چی ؟.

- باشە پێم ناڵێی گەر نێچیرەکە منی بەدی‌کرد چی دەکات ؟.

- بێگومان رادەکات !.

- کەواتە لە دەستمان دەچێت !.

- ئەی تۆ نایگریت ؟!.

- ئاخر من ناتوانم لە دووی راکەم ! .

- قسەتە .. کەواتە هیچ !.

پیرە تانجی وەك گومانی لەبیرەکەی مام کەڵەشێر پەیدا کردبێت ، بە تەوسەوە پێ ی وت :

- مام کەڵەشێر .. لەوە دەچێت ئاوەدان کردنەوەی کۆنە هەوارت لەبیرکردبێت ؟!.

- نا .. چۆن ؟!.

- ئەی نازانی هەموو گیان‌لەبەرێکی ئەم ناوە حەز بە ئاوەدان کردنەوەی ئەم کۆنە هەوارە دەکات !.

- با ... بەرەوەڵلا .

- دەکەواتە .. با ئەمە بەکار بێنین ، لەو باوەڕەدام دەیان نێچیری قەڵەو دەکەوێتە داومانەوە .
- واتە چی بکەین ؟!.
- تۆ بڕۆ سەر کەڵەکە بەردەکەو ، بخوێنە ، هەرچی هات بەدەنگتەوە ، ئەوا پێی بڵێ : ( - من و کاکم دەمانەوێ ئەم کۆنە هەوارە ئاوەدان کەینەوە ) ئەوجا ئەویش لە تەکتا دێت و ، منیش لە پەناوە پەلاماری دەدەم !.
- زۆر باشە .. ئەوا من دەچمە سەر کەڵەکە بەردەکە . ئەمەی وت و ، قەڵەمبازێکی دایە سەر کەڵەکە بەردەکەو ، دەستی کرد بە خوێندن .
هێندەی نەبرد ، ڕێوی‌یەك لێی نزیك کەوتەوەو ، بەکەیفەوە ڕووی لێنا :
- ها .. مام کەڵەشێر چۆنی ؟ . چاکی ؟. ئەوە لەم کۆنە هەوارەدا بۆچی ماویت ؟!.
مام کەڵەشێریش بەر لەوەی خۆی تێك بدات بە ڕوویەکی گەشەوە پێی وت :
- مام ڕێوی ئەوی ڕاستی بێت .. جێ نەماوم ، بەڵکو ویژدانم قبووڵی نەکرد ، ئەم هەوارە وا بە کوێری‌و ، وێرانەیی ببینم ، بۆیە خۆم‌و کاکم گەڕاوینەتەوە ، تا بکەوینە خۆمان‌و ، ئەم کۆنە هەوارە ئاوەدان کەینەوە !. وا دەزانم مام ڕێوی تۆش کۆمەکی ئەوەمان دەکەیت ، کە جارێکی تر ژیان بگەڕێتەوە نێو ئەم کۆنە هەوارە !.
مام‌ڕێوی دەستێکی هێنا بە سمێڵیاو ، لەبەر خۆیەوە کەوتە لێکدانەوەی قسەکانی پیرە کەڵەشێر . ( - خوا ناردی ، ئەمەیە ئەڵێ ، لەلای لابەلاوە خوا دەینێرێ ، خۆی‌و کاکی دەیانەوێ ئەم کۆنە هەوارە ئاوەدانکەنەوە ! . جوانە !. دەبێ کاکی کێ بێت ؟!. تۆ بڵێی خرتە کەڵەشێرێکی چەورو ناسك‌بێت ؟!: یا مریشکە خرپنێکی بەلەزەت بێت !. با جارێ ئەم نەخۆم ، با بچم بە خزمەتی کاکی بگەم ، ئەو دەمە هەردووکیان دەکەمە خۆراکی ئەمرۆم ! .)
بە ڕوویەکەوە کە پاکێتی‌و ، دڵسۆزی لێ دەتکا ، ڕووی کردە مام کەڵەشێر .
- هاوڕێی شیرینم مام کەڵەشێر ، ئەوی ڕاستی بێت .. ئەوەی تۆو کاکت بیرتان لێ کردۆتەوە ، هەنگاوێکی یەکجار بەرزو پیرۆزە ، جا چی لەوە پیرۆزترە کە پیاو بیر لەوە بکاتەوە جارێکی تر ژیان بگەڕێتەوە نێو ئەم کۆنە هەوارە !.وەڵلاهی منیش هەر لە ئێستەوە ئامادەم بە هەموو شێوەیەك یارمەتیتان بدەم !. بەلام تکام وایە کاکت ببینم‌و دوو قسەی لەگەڵدا بکەم .
- وەی بەسەرچاو ، فەرموو پێشم کەوە . مام ڕێوی دووی کەڵەشێر کەوت ، کە گەیشتنە نزیکی پیرە تانجی ، مام ڕێوی هەلات ، پیرە تانجی ویستی دووی کەوێت بەلام زوو هیلاك‌بوو ، هەناسەی سواربوو ، لەتاوا ئاهێکی ساردی هەڵکێشاو بە خۆی وت :
( - کار وابڕوات لەبرسا دەمرین !!)
پیرە کەڵەشێر ڕووی کردە پیرە تانجی :
- برام خۆت هیلاکمەکە ، ئەمەمان هیچ . تانجی بەڕوویەکی گرژەوە وتی :
- ئەمجارە لە دەستم دەرناچێت ، هیوادارم لێم زویر نەبیت .. بچۆرەوە شوێنەکەی خۆت‌و ، بخوێنە !. مام کەڵەشێر بەر لەوەی وەلامی پیرە تانجی بداتەوە ، چووەوە سەر کەڵەکە بەردەکەو ، دەستی کردەوە بە خوێندن .
زۆری نەبرد هەمان ڕێوی بە لایدا ڕەت‌بووەوە ، بێ‌ئەوەی خۆی لێ ئاشکرا بکات ، لێی پرسی :
- مام کەڵەشێر ئەوە لەم کۆنە هەوارەدا چی دەکەیت ؟.
- مام ڕێوی .. ئەوی ڕاستی‌بێت خۆم و کاکم بەو نیازەین ئەم کۆنە هەوارە ئاوەدان کەینەوە ، جا وامن بانگی خەڵك‌و خوا دەکەم تاکو بێن بەدەنگمانەوەو ، یارمەتی‌یەکمان بدەن .
مام‌ڕێوی بە بزەیەکەوە بەخۆی وت :
( - وادیارە ئەم پیرە کەڵەشێرە خەڵەفاوە ..دۆست‌و دوژمنی خۆی ناناسێت !. ئای کە ئاکامی ئەوکارە جوان دەبێت ، گەر بە پشتی دوژمن بتەوێ بەجێی بێنیت !!. با نەچمەوە خزمەت کاکی ، ئەم پیرە کەڵەشێرە دەکەمە پاروویەك .. با کاکیشی لەولاوە لەبرسا بمرێت !.
پیرە کەڵەشێر لە مام ڕێوی پرسی :
-ها مام ڕێوی ئەوە بیر لە چی دەکەیتەوە ؟..
کارەکەمانت بە دڵە ؟.
ڕێوی بە تەوسەوە وتی :-
- ئەی چۆن ؟.. جا کێ هەیە ئەم کارە پیرۆزەی بە دڵ نەبێت ؟.
زیاتر لە پیرەکەڵەشێر نزیك کەوتەوە ، تا دەمی گەیشتی ، کەڵەشێر ترسا ، مام ڕێوی زوو ترسەکەی ڕەواندەوە .
- گوێ‌بگرە مام کەڵەشێر .. تۆ بەم دەنگە خۆشەوەو ، کاکت بەو توورەیی‌یەوە هەرگیزاو هەرگیز ئەم کۆنە هەوارەتان بۆ ئاوەدان ناکرێتەو !. کەڵەشێر پرسی : چۆن ؟!.
ڕێوی بەر لەوەی وەلامی بداتەوە ، پری پیاکردو ، خواردی .

محمد نوري توفيق

# لەرۆژمێرێکی کۆنەوە..

(١)

هەرلەگەڵ خۆی کرد بە چایخانەکەی کاکە حەمەیا، سەدان چاونووسان بەچاوەکانیا... هەلاوی زۆپاکە گوڕێکی هێنایەوە بەبەریا، کورسی یەك هات بە دەستیوە، بەرەولای زۆپاکە بۆی کشا، ئەوانەی دەورووپشتی زۆپاکە بازنەکەیان بۆ گەورە کردەوە.. ئەم سەلاوێکی دا بە گوێیا ناو ئەوانیش بەخێر هاتنیان کرد.. ئەوەندەی پێنەچوو چایەك لەبەردەمیا دانوێا.. نەوییە نانەکەی گیرفانی شەرواڵەکەی، ویستی لەگەڵ چایەکەدا قلیانی‌کا، غەلبە غەلبۆ بگرەو بەردە خۆی بەسەر دانیشتوانی چایخانەکەدا کێشاو درِی پێدانە دەرەوە... سوفی کاکەولاش هەر فریای ئەوەکەوت دە فلسی چایەکە لەژێر پیاڵەکەدا بەجێبهێڵێ‌و خۆی راپێچ بکاتە دەرەوە.. کرێکار هەموو لە پێشی چایخانەکە کۆمەڵ بوون.. کابرایەکی تەنگە ئەستوور لەبەردەمیانا رواەستابوو، سەری بەزۆر لەلەشی جیاکرابۆوە.. لە دەموو چاوێکی شلدا جووتە چاوێکی زەرد هەلکەندرابوون... ئەوەندە گوێزان بەرووەمەتیا هاتبوو، دەمارە شینەکانی هەرئەوندەنەبوو شیتاڵ شیتاڵ‌بنەوە.. پاڵتۆیەکی تووکداری نفتونوێی بەسەر قاتێکی فاسۆندا شۆڕ کردبۆوە، جگەرەیەکی بۆنداری بەلا لێوە گرتبوو، بەفیزکێیەوە چاوەکانی لەخەلکەکە بزکردەوەو دەستێکی لەگیرفانی پاڵتۆکەیا دەرهێنا:

- تەنیا چوارکەسم ئەوێ..! ئەوانیش بەکەیفی خۆم هەڵیان بژێرم..!

نووکی پەنجەی بۆ کرێکارێك ڕاکێشا:

- تۆ... ئاتۆ کەللەزل.

دەیان چاو ئاوڕیان لەو کەللە زلەدایەوە.. ئەویش درِی بەکرێکارەکاندا، بەیەك دوو نووکە سەرسم لەبەردەمیا قوت بووەوە..

- دە ك لەشت داوەشێ زلە.. ئەترسم لە ئیشکردنیشدا واکەلحۆبی..! پاش یەك دوو نەرمە کۆکە چاوەکانی بە کوڕێکی چوارشانەی تێکسمراودا نووسا:

- ئادەی تۆش وەرە... سەرمامانە با ئەوەندە نەوەستین.. لەبەرخۆیەوە:

خۆ زۆرخانەماندا نەناوە.. هەریەکەتان سنگو مەچەکتان پیشا بدەن، بەخواچاکتان ئەناسم.. من ئیشکەرم ئەوێ ئیشکەر.. مەچەکو بازووی هەمووتانم بەیەك منقرناوێ!..

دەستێکی بۆ سوف کاکەولا ڕاکێشا کە لەسەر پەڕەوە بەتەنیادا مابوو..

- ئاخر من ئا ئەومەرە لاتەم بۆچی‌یە قابیلە دای بەستمو کاوجۆی بکەمەبەر ؟!..

هەستی سۆف لە ناخیا کەوتە سەر ئاگرو برژا، بۆیە هەروەك فیشکە شیتە بەڕوویا تەقییەوە:

- بەباوکیشتەوە ناماقوولیت کرد... ئەوی تۆ بەدابەستەی ئەزانی، ئەو بەجانەوەرو درِندەت دائەنێ...

زیاتر لێی هاتە پێشەوەو نەڕاندی بەسەریا:

- ئاڕێم‌کەن با دەمووچاوی جوانتربکەم..

سوورفل بە لێوە لەرزەو دەمێکی گۆ نەکراوەوە:

- ئەوە ئەوبێ ئابڕووە مەبەستی کێ‌یە ؟.

کوڕێکی خریلەی ڕەشتاڵە لە تەنیشت سوفی‌یەوە ڕاوەستابوو.. قسەکانی سۆف جۆشیاندا.. نەیهێشت سوفی وەلامی بداتەوە:

- ئەوە مەبەستی لەتۆیە، بێ‌شەرمی بێ‌ئابروو... ئارێم کەن بانیشانی‌دەم کەئێمە ئاژەڵ‌نین‌و ئەویش جامباز !

بەرەو لای کابرا تەکانی‌دا... جۆشو خرۆش، کشوماتی مەیدانەکەی ڕادا.. یەکێك لەکرێکارەکان:

- کوڕینە نامەردتان مەکەن لەمەش زیاتر ؟!.

جگەرە لە دەم کابرا پەڕی... لەشی کەوتە لەرزە.. پاشەو پاش بۆیێ کشایەوە، بەدەمێکی تێکە لوو پێکەڵەوە:

- ئەوە... چەنە.. بازی.. چیتانە ؟!

کرێکارێکی تر:
- ئەوان چەنە بازنین... تۆ بی غیرەت و زۆر بلێی..
کابرای زلە بیری لەوە ئەکردەوە چۆن لەو ئاگرە سوورەیە دەربازبێ... سەیرێکی دووکرێکارە هەلبژێراوەکەی بەردەمی کرد، وەك پەنایان بۆ بەرێ:
- ئاگتان لێیە لەسەر ئێوە چیم پێ ئەکەن ؟!.
لە ناوبیدەنگی هەردووکیانا دەنگێ پەرچی قسەکەی دایەوە:
- ئەوان برای ئێمەن، بەدرۆ فیشالێ تۆ هەڵناخەڵەتێن !.
سۆفی هاواری لە هەردووکیان کرد:
- ئەوەزەوی گرتوونی، وا لەبەردەمیا چەقیون ؟..
بە یەکیانا ڕوانیو وتارەقی شەرمەزارییان دەردا..
یەکەمیان بەدووەمیان:
- ڕاست ئەکەن، خۆ ئێمە نەفرۆشراوین بەم بێشەرمە.. من ئیش بۆ پیاوی واناکەم..
ئەمیان هاتەوە ناوکرێکارەکان.. دەنگێك هاواری لەوی تر کرد:
- ئەی تۆ بۆ نایەی ناپیاو ؟..
تەڵەی دەمی کرایەوە:
- ناپیاو ئەوەیە بەمنێتی...
چەپکە دەنگێ:
- واز لەگەلحۆی وابێنن باهەرتای ئەوبێ !.
قەڵەو ویستی ئەم گەلحۆیە بقۆزێتەوە:
- ناپیاوینە !.. چاوتان بەخۆتان ئەکەوێ لەکوێتان توند ئەکەم ؟!.
کریکارە خرپلەکە، خوێن چاوەکانی گرتبوو... مووەکانی سمێلی وەك نەشتەر ڕاستبوونەوە.. ڕم بوو لەبەردەم سوورفلدا چەقیو قسەی لە دەمیا تەزان و یەکسەر خپی زەویەکەی کرد.. هەرکرێکاربوو زەکاتی تۆڵەی خۆی دەرئەکرد...
(٢)
ژوورێکی ڕێکوپێکی بۆیەکراو، بە دیواری بەرامبەردا وێنەیەکی گەورە لە چوارچێوەیەکدا، توندکرابوو.. مێزو کورسیەك لەژێر وێنەکەدا وبەشێکی لە ژوورەکەدا گیرکردبوو، کۆمەڵێ کتیبت و کاغەز لەسەر مێزەکە دانرابوو... دوو قەنەفەش لەمبەرو ئەوبەری ژوورەکە، لەسەر فەرشێکی ڕەنگاو ڕەنگ بەرامبەریەکیان گرتبوو، جووتە زوپاکەیش پشتی سەرمای
ژوورەکەیان شکاندبوو.. لە پشت مێزەکەوە تەپڵەبە سەرێکی باریکەلەی ڕە شتاڵە قەڵەمێکی بەدەستەوە بوو خەریکی ڕەشکردنەوەی پەرە کاغەزێکبوو... کابرای سوور فلیش بەدەمو چاوێکی پچڕاوەوە لەسەر یەکێك لەقەنەفەکان دووکەڵی بەبانەدا... پاشماوەیەك بیستویەك کرێکار لە ژوورەکەدا ڕیزکران.. کابرای پشت مێزەکە پاش یەك دوو تف قووتدان، بەزمانێکی ناپاراوەوە کەوتەپرسیارکردن:
- بۆمان دەرکەوتووە کەهەمووتان دزو پیاوکوژو ئاژاوەچیین !..
پەنایەکی بردە بەرجگەرەکەی دەستیو ئەرمە کۆکەیەکی بۆکرد:
- چۆنتان توانی وا لەم پیاوە دڵسۆزو بێ گوناهەبکەن !؟.
دەستێکی بوقەڵەو درێژکردو جارێکیتریش قورگی پاککردەوە:
- ئەم پیاوە لەهەمووتان بەشەرەفترترو نەجیبترە !..
بەتوندی دوو وشەی دوایی دەرپەڕان !، چاوێکی بۆ کابراو چاوەکەی تری گرتە کرێکارەکان.. کەس وەڵامی پێ نەبوو..
- لەگەڵ ئێوە مە، ئەڵێن چی، ئاژاوەچی و پیاو کوژەکان ؟!.
دەنگی هەموویان تێکەڵ بەیەکبوو.
- ئێمە ئاژاوەچی و پیاوکوژنین !.
کابرا بەتوورەیی و سووربوونەوە:
وسبن حەیوانینە، یەکەیەکە قسە بکەن..
سۆفی کاکەولا:
- ئێمە ئادەمیزادین.. حەیوان نین !.
کابرا ژوورەکەی پرکرد لەقیژە:
- حەیوانن و لەحەیوانیش کەمتر !.. تۆ هەر بەناوی خۆتەوە قسەبکە. سوفی مێش میوانی نەبوو:-
- من برای ئەوانم... هەرچیەکتان هەیە هەرمنم و ئەمان ئاگیان لە هیچ نییە..
یەکێکیان ڕێی نەدا کابرا بێتەقسە:
- نەخێر ئەم ئاگای لەهیچ نییە. هەرچیەك کراوە منم !..
یەکێکیتریان:
- نەء من بووم و ئەمان نین..
یەکێکی کەیان
- نەخێر هەرمن بووم...

دەیەمیان، پانزەیەمیان، هەموویان
- نەء، هەرمن بووم و ئەمان ئاگایان لێنییە...
چاوەکانی کابرای پشت مێزەکە فریانەئەکەوت بەکامیان هەڵروانی..
هەر ئەوەنە نەبوو کەللەی سەری بەجێ بهێڵن و دەرپەڕن.. قەڵەمەکەی لەدەست بەربووەوە، چەموڵەکانی کۆتیرەی سەریان گوشی.. کە هاتەوە سەرخۆی جارێکیتر بەرەو ژوورەکە قیژاندی:
- وسبن حەیوانینە.. وسبن.. ئێوە هەمووتان پیاوکوژن.. ئاژاوەچین.. دزن.. درۆزنن !!.
بەبێ پەروا پەنای ئەبردە بەرپاکەتە جگەرەکەی سەر مێزەکەو یەك لەداوییەك دای ئەگیرسانەوە.. چەرخەکەی چزا بەدەستیاو چاوەکانی چزان بەچاوی جوامێر کە لەبەردەم مێزەکە یابوو هاورای لێبەرز بووەوە:-
- ئەی تۆ کوێری یەکە لەچاو ؟..
توندداییەوە بەبنا گوێیدا:
- تاقە چاوەکەی من، لە چاوی زۆر کەس ڕەوانتر ئەبینێ !.
وشەکانی دەمی جوامێر شیشێکی سوورەوە کراوبوون نرا بەجەرگیەوە.. لەسەرکورسیەکەی بەرزبووەوە، ویستی بکەوێتە ویزەی.. ئەمان زووتر لێی هاتنە دەست ولەژوورەکەدا رایان کێشا... سوورفل کەمتری بەرکەوت و رای‌کردە دەرەوەو دەستی بەهاورا هاوراکرد.. ئەوەی جێی داخیان بوو سوورفل بوو کە بەبێ تۆزبوی دەرچوو...
(٣)
لە هەمان ژووردا، هەر ئەو کرێکارانە لەبەردەم کابرایەکی تردا ریزاکرانەوە.. کابرا هەستایە سەرپێ و پاکەتێکی لە چاوی مێزەکەدا دەرهێناو دایەدەست پۆلیسەکەی تەنیشتیەوە کە بەسەریانا بیگێری.. لەسەرەوە دەستی پێکرد لەوسەرەوە بۆی دەرچوو، کەسیان ئارەزووی دووکەڵ کردنیان نەبوو.. لەسەر کورسیەکەی پاڵی لێدایەوە، کەوتە قورگ پاککردنەوە قسەی خوش هەڵڕشتن، بەزمانێکی پاراوەوەو زۆر لەسەر خۆر بەئەرموو نیانی پرسیاری بۆ ریزکردن:
- ئێمەش ئەزانین کە ئێوە هەموو پیاو خراپ نین !..
پاش‌یەك دوو ئەرمەکۆکە، چاوەکانی بەناویانا گێرا.. وەك دڵنیابێ لە دەست پێ کردنەکەی کە تاچرادەیەك کاری خۆی کردووە ؟..
بۆجارێکیتر قورگی پاککردەوە:
- بۆ ئەوەی تەڕو وشك پێکەوە نەسووتێ.. گوناهبارو بێ‌گوناه جیا بکرێتەوە...
قومێکی گەیاندەوە بەجگەرەکەی دەستی:
- تا ئەوی هیچی لەسەرنییە بچێتەوە ناوماڵو منداڵی خۆی... واباشە پێمان بڵێن کە کێ فیرێ کردوون بچن بەگژ پیاوێکی دلسۆزو نەجیبداو لە دایەرەی رەسمیشدا لە پیاوێکی میری بدرێ و بەوردەوردەی بەرن کە ئەمە دوو هەفتەیە لە نەخۆشخانە کەوتووە تا ئێستا نەکەوتۆتە قسەکردن... قومێکی تری دایەوە لە جگەرەکەی:
- حەز ئەکەم تەنها ناوی ئەو چەند کەسە بڵێن و فەرموو برۆنەوە ناو ماڵو منداڵتان...
چاوێکی گێرابە ناویانا... بەوردی دەموو چاوی خوێندنەوە.. بۆی دەرکەوت قسەکانیان لاپەشمە.. ویستی جارێکی‌تر بەشانو باڵیان هەڵبدات:
- ئێمە دڵنیاین کەکرێکار نەفامن ! نەزانن ! هەر تەنها ناوی ئەوانەمان بدەنێ هانیان داون بۆ ئەم کارە ناڕەوایە..
یەك دوومژی درێژی دایەوە لە جگەرەکەیی و چاوێکی‌تری پیاگێران و کەمێ بۆی وەستا.
- ئێستا وتتان چی ؟.
- ...
هێمنی و لەسەرخۆیی کەمێ لەمەوبەری بیرچووەوە، خوێنی هەموو لەشی لە دەموو چاویا کۆبووەوە.. کەوتە هەڕشەو جنێودان.
- دەرکەوت کە هەمووتان پیاوکوژو دزو ئاژاوەچین... بۆیە لێوتان هەڵناپە... ئەگەر وانییە بۆچی زمانی راستیتان شکاوە ؟..
پەنایەکی بردەوە بەرپاکەتە جگەرەکەی:
- گەر راستم پێ نەڵێن خراپتان بەسەر دێنم !..
زمانی زۆری ڕست... گوێیان لێی نەبوو... ئێنجا جنێو وەك بەڕوو لەدەمیەوە دەرپەڕی.. هاواری‌کرد:
- وەرن پەنجەیان وەرگرن... قسە نەکردنیان، داتنانە بە تاوانەکانیاندا !. بیانبەن بۆ شوێنە خۆشەکە:
برۆن خواتان لەگەڵ... بەلام بیرتان نەچی جێگەش بۆ ئەوانە دابنێن کەئەم کارە ناڕەوایەیان پێ کردن !...

(١) ڕووداوەکانی ئەم چیرۆکە ئەگەرێتەوە بۆ ساڵی 1965




● دلاوەر قەرەداغی ●
بەغدا

# لایەنێکی گرنگی درامای یۆنانی

پێش دووهەزارو پێنج سەد ساڵ لەمەو پێش [ ئەسخیلۆس ] ی گریکیی لەسەر زمانی پاڵەوانێکی وەك [ برۆمیسیۆس ] فەرمووی : [ لەمەوبەر ئینسانەکان ، تەنها ئەیانڕوانی‌یە شتەکان ، بێ ئەوەی بیانبینن ، گوێیان بۆ دەنگەکان ڕائەدێرا ، بەلام تێیان نە ئەگەیشتن تەنانەت سەرماو سوڵەی زستانیان لەگوڵو گوڵاڵەی بەهار جوێ نەئەکردەوە ... ئەمە بەم تەرزەبوو ، تا ئەوساتەی ئەو هونەرەم بۆ بەدی هێنان کە ڕۆژهەلاتی‌ی لە ڕۆژئاوا بۆ جوێ کردنەوە ، تا ئەوساتەی فێری زانستی ژمێرەبوونو بە پیتەکان ئاشنابوون ، من بووم بۆ یەکەم جار ، ئاژەڵە کێویو دڕندکانم بە دەستی‌ی ئینسان ڕاهێنا ]

•

بەم تەرزەو پێش دوو هەزارو پێنج سەد ساڵ لەمەوبەرو ئەسخیلۆس وەك کە لە شاعیرێکی سثانۆیی گریك ، مەشخەڵی شۆڕشێکی وای دایە دەست برۆمیسیۆس ، کە داواماڤی مرۆڤە بەشخوراوەکان دەستەبەربکات .. ئەو هونەرەو ئەو ناوەڕۆکەی پێ بە پێی ململانێ کۆمەلایەتی‌یەکە بە خۆوەی گرت ، چرۆی ئەدەبێکی پابەندوزادەی بەگژاچوونو ڕوو بە ڕوو بوونەوەیەکی سەختبوو .

کە ئینسانی گریکی خواوەندی ناسی ، نوێژی بۆ کردو قوربانی‌ی بۆسەربڕی‌و ئاهەنگو سەمای ئاینی بۆ گێڕا ... تاوای لێهات ئەوە ، لە هەموو کارو کردەوەو هەڵسو کەوتێکی ڕۆژانەیشیدا . ڕەنگی دایەوە ، کاتێکیش بینی ئەو خواوەندە زوڵمی لێ‌ئەکاو بوونی‌ی لە قازانجی ئەم دانیە ، ڕوو بە ڕووی بۆوەو بەگژیاچوو ، ئالێرەوە ، برۆمیسیۆسی ئینسان ، لەمیانەی ئەو بەگژاچوونو ڕوو بە ڕووبونەوەیەدا ، وەك سەرەتایەکی مەنتیقی‌یانەی ئەو تەرزە ململانێ‌یە هاتەگۆڕێ ، کە تووی دژایەتی‌یەکی چڕی‌ی سەردەمەکەی خۆی لە تەك خۆیدا ، هەڵگرتبوو .. ، هیچ سەیر نەبوو ، ئەو دژایەتی‌یە چینایەتی‌یە توندەی نێو بینای کۆمەلایەتی ئەسینا ، گەورە بارزگانو خاوەن وەرشەو گەورە پیاوە ڕامیاری‌و سەربازی‌یەکان لە لایەك جووتیارە هێزۆدی‌یەکان لەلایەکی‌تر ، کەزۆربەی زۆری دانیشتوانیان پێك هێنابوو ، ئەمە سەرەڕای ئەو هەموو کۆیلەیەی کە لە ئاکامی هێرشو جەنگێکی زۆرو پاشان خاوەنداریێتی کۆیلەکانەوە ، لە ژێر تەرمی چەوسانەوەیەکی ناهەموارا شانیان قورس بووبوو .

سەیرنەبوو ، لە میانەی ئەو تەرکیبە کۆمەلایەتی‌یە پڕ دژایەتی‌یە پێ‌بەپێی ئەو پەشێوی‌و ئاڵۆزی‌یەی باری ئابووری‌و سیاسی ئەسین بەخۆوەی بینی‌بوو ، هونەرەکەی ئەسخیلۆس وەك کۆشکراوو خولقاوی نێو ئەو وەزعە ، زیاتر بەسروشتی‌ی دژایەتییەکی ئاشنابێ‌و دیوی ڕاستەقینەی ململانێ کە ببینێ ، لە میانەی حەکایەتو ئەفسانەکانەوە ، هونەرێك لە ئازاری ئینسانو ڕزگاربوونی‌ی ئینسان لەو ئازارە دابڕێژێ .

لێرەوەو بێبەپێی ئەو پەرەسەندنەی کۆمەڵگەی ئەسینیی لەرووی بەرهەمو گەشانەوەی پیشەسازیو بازرگانی بەخۆوەی بینی ، پەیوەندییەکی جەدەلی هونەرمەندو شاعیرانی بەکۆمەڵەوە بەستەوە ، ئەو بارو حاڵەتە ، هۆشیارییەکی وایان لەو شاعیرو هونەرمەندانە ئاوادەکرد ، کە دەرك بە هەستیارترین مل ملانێ بکەن و ئاگایان لە سروشتیی دژایەتییەکان بێت .

هەربۆیە ، بابەتو ناوەرۆکی شانۆ نامەکان ، وورده وورده سیمای کەشە ئایینیو بابەتە رۆحییەکەی لەخۆیدا ئەمالی و کالای بابەتەدنیاییو ئینسانییەکانی بەبالای ناوەرۆکەکانیدا دەبری ، دیارە ئەمەش هەرواو لە خۆوە ، نەهاتە گۆری ، بەڵکو ئاکامی ئەو گۆران و پەرەسەندنەبوو ، کە بارە ئابووریو سیاسییەکەی ئەسینا ، بەخۆوەی گرتبوو .

کۆتایی سەدەی شەشی پێش زایین ، گۆرانێکی جەوهەریی لەبینای کۆمەڵایەتی ئەسینیدا بەخۆوەبینی ، ئەمەش لەو ساتەدابوو کە [ قلیسطینیس ] وەك سەرکردەو رابەری ئەو گۆرانانە ، ئەنجومەنی [ ریمۆس ] ی کۆنی هەڵوەشاندەوە ، کەتەنها لە چوار قەبیلە پێك هاتبوو ، ئەنجومەنێکی نوێی چواردە قەبیلەیی لە جێدامەزراند ، ئەمە لای چینی نێوەراستیی کۆمەڵگەی ئەسینی باش کەوتەوەو بەم هۆیەوە ، تەرزە ئیمتیازاتێکی لەسەر حسابیی چینو توێژە ئەرستۆکراتیەکە بەدەستکەوت . بە جۆرێك هێزو دەستەلاتیی ئەوانیی کز کرد ، کە لایەنە ئایینییەکەشی گرتەوە ، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا ، گۆریی پێوەندییە ئایینییەکەی کز کردو بەریی زێوانەو کاهینو پیاوە ئایینییەکانی لە مەیدانی ململانێکەدا تیژتر کردەوە .

لێرەوە ئاسۆیەکی نوێ لەبەردەم هونەری درامادا کرایەوەو خۆی لە هەنگاونانێکیترا ، بۆ رووبەروو بوونەوەی بابەتە دنیاییەکان بینییەوە ، کە ئەمە ئەڵێین ، گەرەکە ئەوەش بڵێین ، نەبوون و بێهێزیی دەستەلاتە ئایینییەکە نەتین و تاوی سیمای کەشە ، دیو نیزیو سیسییەکەی کەم نەکردەوە ، چونکە ئەو کۆمەڵگەیە دەسبەرداری خواوەندەکانی نەبووبوو ، تەنها ئەوەبوو بەرامبەر راڤەو تەفسیرە تەسکەکەی پیاوە ئایینییەکان ، تووشی جۆرە کاردانەوەیەك هاتبوو ، بە جۆرێك ئەمان بەو تەفسیرەی ئەوان بۆ پەیوەندی ئینسانو خواوەند رازی نەئەبوون و دڵیان بەو سەرەنجامە ئاوی نە ئەخواردەوە .

هەڵبەت ئەمە سەرەتای هەنگاو نانە گەورەکەو نزیك بوونەوەو توندو تۆڵ بوونیی واقیعییانەی هونەرەکە بووبە خواوەندو بە ئینسان و بەبارە ئابووریو گۆرانە سیاسییەکانەوە .. ئەوچەکەرە ریالیزمییەی ، ئەمامی هونەری درامای گریك گرتیی سەرەتاو بنەچەی زەمینەی [ هۆشیار ] ی یەكبوو ، بەرامبەر سروشتی ململانێ چینایەتییەکەو هۆی دۆزینەوەو ساغ کردنەوەی پەیوەندی یەکان . لە جیهانە کۆمەلایەتییەکەیدا .

ئەتوانرێت ئەمە وەك شتێکی شمولیو پێناسەیەکی گشتگیر بەسەر هەموو قۆناغە جیا جیاکانی پەرەسەندنی هونەرا دابرابێت . هەڵبەتە ئەمەوەك وەزیفە ، لە کۆمەڵگەی سەرەتاییدا لە قۆناغەکانی دی جوێ ئەبێتەوە ، دیارە ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەیە کە هونەرەکەی نێو ئەو رژێمە کۆمەلایەتییە ، بێ بە پێی دواکەوتوویی بەرهەمو پاشکەوتوویی توانای تەکنیکییەوە ، وەك خەونێك لای هونەرمەند بۆ دەست بەسەرا گرتنی سروشتو . بەدی هێنانی ئامانجەکانیان دەرئەکەوێ ، بەلام پاش ئەمەو پاش هاتنی رژێمی کۆیلایەتیو هاتنە کایەی چەوساندنەوەو ململانێیەکی چینایەتیی ، وەزیفەو دەوری هونەرەکە وەك نەوع ، لە خەون و هاتنە دەر خەونەکەی هونەرمەند دا نەمایەوە ، بەڵکو سیمایەکی هۆشیارانەی بۆ دەرك پێکردانی ئەوپەیوەندییانە بەخۆوەگرت .

ئەو رژێمە کۆمەلایەتییەی ، کۆمەڵگەی ئەسینیی تیایا بوو خەست بووەوەی ململانێیەکی قورس بوو ، بۆیە ئەو هونەرەی لەو واقیعەوە هەڵهێنجرا ، هونەرێکیوابوو کەسیماو شێوازی دژایەتیە چینایەتییەکەی گرتبوو .. ئەم بارو حاڵەتە ، کەسانێکی وایان گەرە کە ، بزانێ چۆن لەسروشتیی ئەوپەیوەندییانە ئەگاو واقیعییانە جۆرە پێوەندییەکی توندو تۆڵ لە نێوان خۆیو خودی خۆیو بارەبابەتیو مەوزووعییەکەدا گرێئەدا ، ئەو پەیوەندییە واقیعییەش بەخۆراکی کۆمەڵێك بیرو هەڵوێستی سەردەمەکەی خۆی گۆش ئەکرێت .. [ سیدنی فنکلشتین ] ووتەنی : [ ئەو پەیوەندییە واقیعییە گشتکات ، قەوارەیەك بیری نوێ لەخۆیدەگرێ ،

که چۆنیەتی گۆڕینی جیهانەکەو پاشان تێگەیشتن لێ ی بە چاکترین شێوە ، بەئاکام دەگەیەنێ ]"[1]

ئەوەی لێرەدا مەبەستمان بوو بیڵێین ئەوەیە ، ئەو قۆناغە مێـژوویی یـەی هـەر کـۆمـەڵگـەیـەك لە کـۆمـەڵگـەکـانی پیاتێپەڕئەبێت ، جۆرە هونەرێکی وا لەتەك خۆیدا بەدی دێنێ ، کە پابەندو پاشبەندی رادەی پەرەسەندنی کۆمەڵگەکەبێت ، ئەو هونەرەش ، لەو قۆناغە مێژوویی و رادەی پەرەسـەندنـە تایبەتی یەیدا ، وەك هونەرێکی واقیعی حسـابی بۆ دەکـرێ و تەفسیرێکی زێدە گرنگی لە ڕەوتی دەسبەسەراگرتنی سروشت و بەرەو پێشەوە چوون داهەیە ، نەك هـەر ئەمـەندەو بـەس ، هـەندێ جـار ئەو هـونەرە دەگـاتـە مـەودایـەك کـە سـاتـە واقیعی یەکەی خۆیشی بەجێ دێـڵێ و جۆرەگشت گیـری یەك لە قۆناغە جیاجیاکانی تریشدا بەدی دێنی .. واتە پێناسنامـەی جۆرە واقیعی یەتێکی گشتکاتی ی بەبابەت و مەوزووعەکـەی رەوا دەبینێ ، ئەمەش وای لەیەکێکی وەك [ مارکس ] کردووە بفەرموێ : [ گرانی ی تیا نیە ، دەرك بەوەبکرێ کە داستان و ئـەفسانـەکانی نیـو هونـەری گریـك ، بەچـەند شێـوازێکی دیـاری کـراو ، پـابـەنـدی شێـوازەکـانی پـەرەسـەنـدنی کۆمەڵایـەتین ، بـەڵام قورسـەکاتێـك بەدووی ئـەو هۆیـەدا ئەگەڕێین ، کەئەوهونەرە تائێستا دەکاتە سەرچاوەی چێژێکی ئیستاتیکی یانە ]"[2]

ئەو لەحزە واقیعی یەی کە لەقۆناغە مێژوویی یـە دیاری کراوەکەدا دەبێتە خوڵقێنەری ساتە ئینسانی یە شمولی یەکە ، جۆرە نەمری یەك بەبەرهەمەکە ئەبەخشێ و وەك گیانێکی زیندوو ئەیهێڵێتەوە .

## یۆربیدس و هونەری ریالیزمی گریکی ی ..

گـەران بـەدووی ئـەو زەمینـە واقیعی یـەی کـەیـۆربیـدس بەرهەمەکانی خۆی لەسەر بنیاتنا ، بەشێوەیەکی ئاسـانترو روونتر لە ئەسخیلۆس و سۆفۆکلیس خۆی ئەنوێنێ ، ئەو گوڕە واقیعی یەی ئەم بەرەوپەرەوەی بزووتنەوەی درامای گریکیدا ، شـایـەتێکی چـاکی ئـەو تـەرزە شـانـۆیـەیـەو نـاوەڕۆك و بەرهەمەکانیشی زادەی ژیانە واقیعی و ماددی یەکەبوون .

سەیر نەبوو ، یۆربیدس لەسەر حسابی لادان لە واقیعی ئـەفسانـە باوەکـان و ماددەی حـەکایـەتەکـە ، لەئینسـانـە ئاسایی یەکان نزیك بێتەوەو تەمی وەهمە ئەفسـانەیی یـەکە لەبەرهەمەکان برەوێنێتەوە .. ئەوەتانێ بروفیسۆرغب ئەڵێت : [ ئەو تەراژیدیایەی کە یۆربیدس بینی یەوە ، بەرگێکی میسالی بەبالایـدا بردرابـوو ، بەڵام ئـەم بەرەو رێچکـەی نەهجێکی ریـالیزمی ی بـردی ، گەرچی ئـەقلی یـۆنانی ی ئـەوکاتـە لەو توانایەیدا نەبوو ، ئـەو نەهجـە لەتەمـە میسالی یـەکە جـوێ بکاتەوە ، هەروەك ئەوەی ئێستا ئێمە تێ ی دەگەین و جوێ ی دەکەینەوە بەڵام کاتێك یۆربیدس لەسەر پاڵەوانە گریکی یەکانی نووسی زێدەتر بەرەو بەرگە واقیعی یەکەی بردن ]"[3]

شۆڕبوونەوە بەناخی بارەکۆمەڵایـەتی یەکـەداو دیاری کردنی هەڵوێست بەرامبەری ی ، مـۆرك و سیمایـەکی دیاری شانۆی یـۆربیدس بـوو ، ئەمـەلەو کاتـەدا کەپـەیوەنـدی یە کۆمەڵایەتی یەکـان بەحـوکمی ئاڵۆزبـوون و نەشئـەو نومـای بیری ی نەتەوەیی کە جەنگی یۆنـانی و فارسی ی بـەدی هێناو پاشان گەشەی بیری فەلسەفەی یـۆنانی ی زەمینـەی فیکری شانۆکەی یۆربیـدسیان بـەبارانی ئـەو دژایەتی یـانە ئـاوداو بوعدێکی واقیعی ی تریان جوێ ، لە شانۆکەی ئـەسخیلۆس و سـۆفۆکلیس پێ ڕەوابینی ، ئـەوەتانێ [ جـۆرج تۆمسن ] لە کتێبەکەیدا [ ئەسخیلۆس و ئەسینا ] ئـەڵێت [ یۆربیـدسیش وەك ئەسخیلوس ، لەپەیوەندی بە کۆمەڵگەکەیەوە ، خاوەنی هۆشیاری یـەکی ئیجابی ی بـوو ، بەڵام وەك کـارودەورەکەی جیاوازی یەکی جەوهەری ی لەتەك ئەوداهەبوو ، ئەمیش لەبەر ئـەوەی کۆمـەڵەکە لەڕەوتی گـۆڕان و پەرەسـەنـدن دابـوو ، یۆربیدسیش لەمنداڵی یەوە لەسەربیری یەکسانی و دیموکراسی ڕاهێنرابوو . هەر لەبەر ئەمەش تێکچوونی شیرازەی خێزانی لە ژێردەست کردنی ئافرەتـا ئەبینی یـەوە ، وەك ئەوەی ئـەو ئـاکامـە ناقـولایانـەی ئەبینی ی کـە گیانی مـانەوی یـان بێ هێزدەکرد ، ئەمەش ئاکامی ئەو سیاسەتە داگیرکاری یەبوو ، کـە بەنـاوی دیموکـراسیەتـەوە دەکرانـەسەر نـاوچـەکـانی دەوروبەر"[4] ]

بـیـرو هـەڵوێسـتـەکـانی [ لانـکسـۆغـۆراس ] و [ بروتۆغوراس ] و [ سوکرات ] کارێکی زێدەکاریـان لەتین و تاوی بەرگە واقیعی یەکەی یۆربیدس کرد ، ئەوەتانی یۆربیدس لە ژێرکاری واتاو مەفاهیمەکانی [ ئەنکسۆغۆراس ] دا داوای [ پێـویستی ی دامـەزرانـدنی و بـەکـارهێنـانی ئیـدراکی یـە

هۆشمەندی‌یەکەی لە واتا فیکری‌یەکاندا ئەکردو داوای تەفسیرکردنیانی لە میانەی بنەچەیەکی ماددی‌واوە ، کە گشت ـەلالەتێکی میسالی یان سۆفی ڕەت بکاتەوە ، دەکرد"(٥) ] بیرو فەلسەفەی [ بروتۆغۆراس ] یش ، کە داوای ڕزگارکردنی پەرستن‌و عیبادەت لە سیماو بەرگە ئەفسانەیی یەکەی ئەکاو ، پاشان ئینسان ئەکاتە بنەچەو پێوەری هەموو حەقیقەتەکان ، هەوێنێکی دیاری‌ی نێو بەرهەمەکانی یۆربیدسە .

دکتۆر فائق الحکیم ، بەرانبەر دەوری یۆربیدس لەبەرەو پێش بردنی درامای کۆمەلایەتی‌و نێزیك‌بوونەوە لە سیما واقیعی‌یەکە ئەفەرموێت : [ یۆربیدس بەرانبەر سروشتی ململانێکەی ئەسینا هۆشیاربووە ، بۆیە بە سروشتی ئەو وەزیفەو دەورەی زانیوە کە بەرانبەر ئەو ململانێ‌یە کەوتۆتە سەری ، ئەم هەست پێکردن‌و پێ‌زانینە لە کاتیکۆری‌یەکانی پالەوانی ئەفسانەیی ڕووتی کردەوەو پالەوانێکی کۆمەلایەتی‌ی پابەند ، بەواقیعەکەی لەجێ‌بنیات‌نا ، کە ئەمەتەجسیدکردن‌و پیشاندانی ئەو وێنە ڕاستگۆیەیە کە سروشتی ململانێ‌کەی تیادا ئەبینرێتەوە"(٦) ]

ئەمەی دکتۆر باسی لێوەئەکا ، زیاتر ئەمان گەیەنێتە ئەو قەناعەتەی ، ڕەواندنەوەی هەورە ئەفسانەیی‌یەکە لەئاسمانی سروشتی پالەوانەکە ، بەدی هێنەری پالەوانە کۆمەلایەتی‌یەکەیەو پاشان پێدانی بوعدێکی واقیعی‌یە بە شانۆ نامەکان .

لەتەك ئەو گۆڕانە گرنگەدا کە مەداری‌ی ناوەڕۆك‌و بابەتە درامی‌یەکانی گرتەوە ، ئەو گۆڕانە شێوازو ئسلوبیشی وەك لایەنێکی نەپچڕاوی ناوەڕۆك گرتەوە ، ئەو ناوەڕۆکە نوێ‌یەی بنووسێك ئەیویست تەعبیری لێوەبکات ، نەیدەتوانی‌ی لەگەل تەکنیك‌و ئسلوبە کۆنەکەدا ڕێ‌بکات ، لێرەوەشان بەشانی بابەتە نوێ‌کە جۆرە شێوازێکی نوێ هاتنە کایەوەو شاعیرەکەیان لە کۆت‌و پێوەندی تەکنیکە کۆنەکە ڕزگارکرد . بۆیە لەوەو دوادەبینین زمانی شانۆ نامەکان ، لەموفرەدات‌و زاراوە قورسەکاندا نەمایەوە ، بەلکو بەرەو ڕێچکەی زمانێکی هاوچەرخانەی واهەنگاوی‌نا کە خاوەنی جۆرەسادەو ساکاری‌یەك‌بوو ، ئەو زمانە ئەیتوانی زیاتر لە تەك بابەتە واقیعی‌یەکەدا بگونجێ‌و ئەیتوانی ڕەهاتر تەعبیری لێ‌بکات .

دکتۆر [ عەلی جواد طاهر ] یش لەکتێبەکەیدا ، [ مقدمة في النقد الأدبي ] ، ئاوها لەو دەورە گرنگە ئەدوێ کە یۆربیدس لە درامای گریکی‌دا هێنایە گۆڕێ‌و ئاوها باسی ئەو بوعدە واقیعی‌یە ئەکا : [ ئینسانە پەرەسەندووە نوێ‌کەبووە نێوەندو مەداری شانۆ نامەکانی یۆربیدس ، ئەو بڕوای وابوو کەپێویستە ئینسان ببێتە میحوەری بابەتی شانۆ نامەکان ، لێرەوە وێنەکێشان شی‌کردنەوەی دەروونیان‌و تێگەیشتنی هەلس‌وکەوتیان دێتەدی"(٧) ]

پاشان دکتۆر عەلی‌جەواد ، لەفەلسەفە تایبەتیەکەی یۆربیدس بەرانبەر قەدەر ئەدوێ‌و ئەلێت : [ چاوگەی گشت هەلس‌و کەوتێکی مرۆڤایەتی‌و چاوگەی هەموو بەختیاری‌و نەهامەتی‌یەك ، بۆ بڕوابوون بەبیرو باوەڕێکی جێگیر ، یان بۆ قودرەت‌و ئیرادەی خواوەند ناگەڕێتەوە ، بەلکو چاوگەی ئەوەپێش گشت شتێك سروشتی مرۆڤایەتی خۆیەتی یۆربیدس هەموو بۆچوون‌و دیراسەکانی لە پێناوی ئەوڕاستی‌یەدا خستەکار . لێرەوە ئەبینین ، لەگۆشە نیگای ئەو بۆچوونەوە ، گرنگی بەدین‌ئەدا . ئەگەر پێوەندی بەهەلس‌وکەوتەکانی ئینسانەوە هەبێت هەمان شتیشە بۆزانیاری‌یە سروشتی‌یەکان ، کە یارمەتی کەسان ئەدا بۆ ڕزگاربوون لە تەمی ئەفسانەو خەرافاتەکە ، لەهەمان کاتدا دەسبەرداری هەمووشیان دەبێ ئەگەر ئەگەروا لە ئینسان بکەن لە ڕاستی‌یەکان ڕابکاو لێ‌یان دوورە پەرێزبێت"(٨) ]

ئەمەش ئەو بوارەمان بۆ بەدیارئەخات ، کە بیرو فەلسەفەی یۆنانی تامەودایەکی زۆر کاریان لە بابەتەکانی یۆربیدس کردووە ، ئەمە لەلایەك ، لەلایەکی‌دی ، پەرەسەندنی کۆمەلگەی ئەسینی لەڕووی ئالۆزبوونی پەیوەندی‌یەکان‌و پاشان بەرەو هەلدێر چوونی بارەدیموکراتیەکەی ئەسینا ، خۆیان لە خۆیاندا بەدی هێنەری زۆر مەسەلەو بابەتی نوێ‌ی وابوون ، کە پەیوەندی‌یەکی زێدە کاریگەریان بەبارە کۆمەلایەتی یەکەو پەرەسەندنی بۆ چوونەکان هەبوو ، ئەبینین یۆربیدس بە شێوازێکی نوێ لەمەسەلەی ڕزگارکردنی ئافرەت لە کۆت‌و پێوەندی دیلی ئەدوێ ، هەروەك ئەوەی باس لێوەکردنی سۆزی خۆشەویستی‌و ڕزگارکردنی کۆیلەو یەکسانی‌و .. هەموو مەسەلەکانی‌دی ، لە بیرو بۆ چوونی یۆربیدس‌دا ، بە شێوازێکی نوێ‌ی پێوەند دار بە واقیعەکەوە ، بووبوونە




هونەر . [ زۆربەی شانۆ نامەکانی یـۆربیدس ، گـەر بەرگی نـەزعە شیعـری‌یەکـەو ئەو شتـانـەی پـەیـوەنـدی بـە بینـا شانۆیی‌یەکەوە هەیە لێ‌ی دابمالین ، دەبینین ئەو بابەتانـە لە ناخی نەهجە ریالیزمی‌یەکەدان ، چونکە ئەو لەو بابەتانەدا ، کێشەو تەنگەو چەڵەمەیەکی کۆمەلایەتی پێش‌چاوئەخات ، یان هێرشی کردۆتە سەر بیرو خەرافەیەکی ئاینیی ، وەیاخود گاڵتە بەبیرو باوەرێکی سیاسی‌ی دەکات ، یاخود تەقلیدێکی ناپەسەند ئەرووخێنی کە ناتوانێ لەتەك گۆری ژیانەکەدا بریکات(٦) ]

ئەمەی تا ئێرە باسی لێوەکرا ، جارێکی‌تر ئەمانباتەوە ، بۆ ئەوەی بڵێین ، ئەو رەگەو ریشە ریالیزمی‌یەی درەختی درامای گریك هەیبوو ، گەرچی ئەو کاتە وەك رێبازو قوتـابخانـەیەکی ناسراوو سەربەخۆ حسابی بۆنەکرابوو ، بەڵکو وەك رەگەولقی نێو قوتابخانە کلاسیکی یەکەو وەك کۆمەڵێك بنە مـاویاسـای پابەند بەپێشکەوتن‌و پەرەسەندنی کۆمەڵەکەوە ، خۆیان لە نێو ئەو قوتابخانەیەدا تـواندبـۆوەو هەر لە نێـو بۆتـەی ئەودا ، بەئەرکە پەروەدەیی‌و کۆمەلایەتی‌یە گەورەکەش هەڵسان .

### سەرچاوەو پەراوێزەکان ..


١- الواقعية في الفن . تاليف : سيدني فنكلشتين . ترجمة . مجاهد عبدالمنعم مجاهد المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع

٢- الاشتراكية والفن . تاليف : آرنست فيشر . ترجمة : اسعد حليم دار العلم بيروت .

٣- يوربيدس . تاليف : إيليا حاوي دار الكتاب اللبناني للطباعة والنشر .

٤- اسخيلوس واثينا تاليف : جورج تومسن

٥- تاريخ المسرح تاليف : د . فـائق الحكيم . جامعـة بغداد ـ اكاديمية الفنون الجميلة .

٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو .

٧- مقدمة في النقد الادبي تاليف : د . علي جواد الطاهر المؤسسة العربية للدراسات والنشر

٨- هەمان سەرچاوەی پێشوو .

٩- اشهر المذاهب المسرحية تاليف : دريني خشبه .


سەرنج : ئەم باسەی سەرەوە ، بـەشێکی ئەو کـۆرەیە ، کـە نیاز وابـوو ، لە وەرزی دووەمی رۆشنبیری کـۆمەڵەی رۆشنبیـری کوردی لەبەغدا بخوێنرێتەوە .

د ووتارێت طوافێت ئێزدیـا(١) و طاوس گێرانێ دا(٢) ئـەڤ پەیڤە چەندەها جار ل رووێ خوندەڤانێت هێژا تێتـە هلدان . ڤێجا مجێور کی‌یە ؟ دەورێ مجێوری ل گوندێ ئێزدیا چی‌یە ؟ ب چی چاڤی گوندەی درێننە مجێورێ خۆ ؟؟

ئاشکرایە هەر گوندەکی ئێزدیا تو بچی‌ێ دێ قوبەکێ ، ئاقدەکێ یان پتر ل بەر چاڤترین جهـ ، چی سەرێ گرکی‌یە یان مەیدانە ، بینی کو شوون وارگەهێ یان مەقامێ خاسـەکی ، بابچاکەکی خودێ‌یە ژ خاسێت ئێزدیا . ل پشتا قوبێ ، یان کا ئاقدە ، هـەجرکـە چی‌یە ، گـۆرستانێ گـوندی ژی وێ لێ ، گوندەی مریێت خۆ لێ ڤەدشێرن . ڤێجا کی سەروکوها ل ڤێ قوبێ یان ئاقدێ و گۆرستانێ دکەت ؟

بێگومان ژ نەڤێت ڤی خاسی یـان بابچـاکی کور ل دوو بابێ ، کو ژ مایێت جهـو شوون وارێ وی‌یە ، سەروکـوها لێ دکەت‌و دبێژنێ مجێور .

لەوما ژ هەرە ئاکنجیێت کەڤن ل گوندێت ئێزدیا مجێورن ، و دڤێت ژ مالێت ئادیا بن ، ئانکو پیر یان شێخ و هەکە هـات‌و بنەمالا مجێورێ گوندەکی کۆر ئوجاغ بوو کەتخـودایەك کـو شکەستی‌ێ خودێ‌و خودان خۆف ژ مریدێت مالا وی مجێوری دێ بتە سەردەری‌و مجێـورێ گونـدی . یان هـەکە مـریدێت مجێورێ کۆرئوجاغ بووی ل وی گوندی نەبن و بنەمالەکا مالێت ئادیا ، چی پیرو چی شێخ ، ل وی گوندی بت دێ کلیل‌و نیشان‌و چرایێ خاسێ گوندی سپێرنە وێ مالێ‌و دانین مجێـورێ خۆ . گوندی‌ی ژی لسەر خاترا خودێ و خـاسێ گونـدی کو ئـەڤ جوامێرە ب رەزا وان‌و میرێ شێخاو ئەختیارێ مەرگەهێ بوویە سەردەری‌و خلمەتکار ب چاڤەکی پر رێزو قەدر درێننە مجێورێ نوو .

ئێزیدخان بەرێ یە بۆش‌و بـەرفرا بـوو لێ فرمـانێت ب



## خدرێ پیر سلێمان

1984/3/29

ـــەرواندا دارژیـان نەخـاسمە ل چـەرخێ بووری هـەردوو
ەرمێنیت دژوار و سامناك یا میرێ کۆرە د سالا 1831 ز و فرمانا
ـەر لەشکەرێ ئۆصمانـلی فریق پـاشا ل سـالا 1892 ز[3] . ب
ـەدەما گـوند هـاتنە ویـرانکرن ژ هـەزارا ئێکی کەڤلێ خۆ
حلاس‌کر و خۆ گەهاندە مەرگەها شێخا . ل مەرگەهێ ژی ئەو
ـەر پێلێ و لینگا ڤەرەسیا یێ د دەحل‌و شکـەفتا ، د گـەلی‌و
ـەرێت چیادا مای . هەتا تاف شەقتی کتەکا مای جارەکا دی
ـت جڤیان و هندەك گوند نووژەن ئـاڤاکـرن .. ڤێجا هـەبوو
مجێوریێ ڤی گوندی پشتی گوندێ وی کاڤل‌و وێران‌بووی قەستە
گوندەکی دی بکەت و لێ ئاکنجی‌بت یان گوندەکی مجێوریێ وی
ـبەر پێلێ چووبت ، و چاخێ گوندی‌ی زڤرینە سەر وارێت خۆ ژ
حۆرا مجێورەکی نوو ژ بنەمالەکا ئادیا بەرچاڤ‌کرن .. بۆیێ نمۆ
ـ هندەك گوندێت ئێزدیا دبینی بنەمالەك مجێورێت خاسەکینە و
ـە ژ نەڤێیت وی خاسینە وەکی مجێورێت ئێسڤنێ ـ مەرکەزا
قەزا شێخا ـ کو پیرێت پـیر بوالن و بـەری سەدوهـەشتا 180
ـسالەکی ژ زۆزانا ژ سێدەرێ هاتینە .. ڕاستە هەڤت خاسێت ل
ئێسڤنێ : [ شێخالێ شەمسا ، شێخ مەند ، پیر بازید ، عەڤدێ
ـرەش ، شێخ حەنتوش ، پیرکێ خۆش ئاڤای ، مەلیشێخسن ]
ـێ چوو ئاقدو نیشانێت پیر بوال ل ئێسڤنێ نینن ! پا کی بەرێ
مجێوریێ ئێسڤنێ بوو هنجی من ژ پیرەمێرو ریهـ سپی‌یا پرسی
من چوو سەرەدەر ژێ نەکر ..

ژ کنارەکی دیڤە چەندەها قوب‌و ئاقدو نیشانگەهـ نهـۆ
مجێورێت وان لێ نەماینە وا بارکریە جهـ و وارگەهەکی دی یان
نەو گوندو وارگەه د دەستێت ئێردیادا نەماینە هەروەکی مـە
گۆتی ژ ئەگەرا فرمانێت دژوار بێت د چەرخێت بۆری‌دا ب سەر
واندا بارین .

بۆ نموونە : دەشتا حەریرێ ل هەولێرێ هەتا نوکە ژی
نیشان‌و قوبا پیر هەسلمەمان وا لێ ، ل فرمانا میرێ کۆرە ل سالا
183 ز . بەهرا پتـر ژ گونـدێت ئێزدیـا ل وێ دەڤەرێ هـاتن
ـێ شێل‌کرن ، بێت رێکا ئۆلا خۆ گهۆڕین لسەر گوندێت خۆ مان‌و
ـێت دی ژ هەزارا ئێکی کەڤلێ خۆ خـلاس‌کر و خـۆ گەهـاندە
مەرگەهێ . وەکی مالێت خدر مەممەدا کـو ژ کەلەکێ هـاتن
ئێسڤنێ . پیرێت هەسلمەمان وەکی پیر حەمۆیێ مجێوریێ وی[4]
ژ منرا گۆتی هنـد کەهشتن هلێـل و نیشانێت خـۆ بکەهێننـە
مەرگەهێ ، نهۆ هلێل وا ل مالا پیر حەجی‌ێ باسکی ژ پیرێت
هەسلمەمان ..

ل پیربووبی و هەسنەکاو بێرستەکێ .. هتد .. بگرە گەلی
خودێدای و گرخاسێ‌و حەسەنی‌ێ‌و جـەروانا کـەڤن و گەلەك
گوندێت قوب‌و ئاقـدو نیشانگـەهێت خاسـا وێت لێ هەین ، لێ
مجێورێت وان ب گوندی‌یاڤە یان وێت کۆرئوجاغ بووین یـا وا
بارکریە هندەك گوندێت دی . پیرێت خانێ[5] کو مجێورێت ئێزدی
بوون ل زۆزانا ل دەڤەرا بایزیدێ هەوە بەری سـەد و پێنجی
سالەکی هاتینە ئێسڤنێ ئاکنجی‌بووین .

مجێورێت پیرێ جەروا بەرێ ل جـەروانا کـەڤن بوون
بەری 130 سالەکی بارکرن هاتنە ئێسڤنێ هەر چەند هەتا نوکە
ژی هێڤارێت هەموو چارشەمبو و ئینی‌یا و هێڤارێت عیدو جەژنا
ژ ئێسڤنێ قەستا ئاقدا پیرێ جەروا دکەن و چرایێ خودانێ خۆ
ڤێدخن هەرهۆسا ل طواف‌و بانگێرا دچن طوافـا وی دکەن و
گوندێت باسکی تەڤدا دگەل ئێسڤنی‌یا دچنە وێ طوافێ .

هەتا بەری بیست سیهـ سالەکی مجێوریێ گونـدێ پیر
بووبی ژ مەهەتێ دچوو طوافا شێخوبەکر دکرو باسکی هەموو
دچوونە وێ طوافێ .

**دەورێ مجێوری د گوندی‌دا :**

د ووتارا رەنجبەری‌ێدا[6] من بچەکێ لسەر تەرزێ ژیانا
گوندێت مە و لەپەژینا وان نڤیسی‌بوو و تێدا هاتبوو کو د هـەر
گوندەکی‌دا کەتخودایەك یان چەند کەتخودا هەینە ژ کنـارێ
مالداریێ‌ڤە سەروبەرێ وان بی باشە ، خودان جۆت‌و جۆبارو
پەزن لێ بەهرا پتر ژ گوندی‌یا کرمانجێت هێرڤە وێڤە بوون . لێ
من بەحسێ سەروبەرێ مجێوری و لەپەژینا وی نەکربـوو . ژ
کنارێ دنیاداریێ‌ڤە دڤێت مجێور بەرکا خۆ ژ ئاڤێ بینتەدەرو
ئـەوژی مینا هـەموو گـوندی‌یـا ژ خۆرا کـرمانجی‌ێ دکـەت

دەخلودانی دچینت ، تەرش و پەزی خودان دکەت .

راست د گوندیدا مختاریٚ هەی کو گوندیی هلدبژیٚرن پشتی دەستووریێ ژ خوندکارو میری لدەفەریٚ وەردگرن هەرچەند موختاریٚ گوندی کوٚچکا هەی لیٚ مجیٚوری ژی کوٚچکو قەهوا خوٚ وا هەی . مجیٚور دڤیٚت یی قەولزانو ب دەڤوزمان بت کوٚچکا مجیٚوری قوٚناغا بابیٚ شیٚخ(٧) « ئەختیاریٚ مەرگەهیٚ » یە کو هەر سال جارەکیٚ بابیٚ شیٚخ هەر شەڤ ل گوندەکی ل کوٚچکا مجیٚوریٚ گوندی دبتە میڤانو گوندیی تەڤدا لیٚ دجڤین ، گوهداریا قەولو بەیتو نەسیحەت و شیرەتو تەکبیرا دکەن ، ریٚکا ئیٚزدیاتیی ژ وانرا ڤەدژویٚرت .

مجیٚوریٚ گوندی دڤیٚت هەموو هیٚڤاریٚت چارشەمبوو و ئینییا و هیٚڤاریٚت جەژن و عید و عەرەفاتا کوسکیٚ تژی بزرو قەڤدەکا فتیلیٚت پەمبووی دگەل خوٚ هلگرتو بچت چراییٚ خاسیٚت گوندی هلکەت .

ل طوافا گوندی : بەری طواف ب چەند روٚژەکا مجیٚور نیشانیٚت خودانیٚ خوٚ ، ئانکو خاسیٚ گوندی ، هلدگرتول گوندی دگەریٚت مال ب مال هەر مالەکیٚ کییەکە روونیو چەند هیکەکاو دەهنی سماطیٚ بوٚ سماطا طواف خردکەت . و ل هیٚرە ب پیٚتڤی دزانم چەندەکیٚ ژ ووتارا طوافیٚت ئیٚزدیا ، کو دەوریٚ مجیٚوریٚ گوندی تیٚدا ، وەرگرمو بنڤیسم .

[ هیٚڤارا طوافیٚ هیٚشتا نیڤروٚ مجیٚور دچتە بەر قوبیٚ دەری ڤەدکەتو های ل گزیریٚ گوندی ددەت دا سیٚ جار دەنکەکا باندەت کو خوٚرت و لاو بیٚن بەر قوبیٚ یان ئاقدیٚ جوانکەنو کیژك ئاڤیٚ ژ کانییٚ بکیٚشنە بەر ئاقدیٚو سیٚ چار دەنکا تژی ئاڤ کەن .. و دبیٚژتە شازبەندی دا شازیٚ ئیٚزیو پاشی شازیٚ طوافیٚ لیٚبدەت . گوندیی هیٚدی هیٚدی پشتی سەربڕ کوشتینو گروواین و ب کابانییاڤە سپارتین ، دیٚ خوشینە بەر قوبیٚو مجیٚور لبەر دەرچکیٚ یی روونشتییە و دەست ب دوعا و دروٚزا ، قەولو بەیتا دکەت .. ]

ڤیٚجا هەر وەکی ب دریٚژی د ووتارا طوافا دا هاتی [ هیٚڤارا طوافیٚ شیڤا گوندییا یا طوافیکەرو خووندییا دیٚ لبەر قوبیٚ بت ، هەر مالەك دیٚ تەبلییەکە گراریٚ یان ئابراغاو سەرکیٚ سەربڕیٚ لسەر دانیٚت و ئیننە بەر قوبیٚ ، هەتا نیٚزیکی عەسرەکە تەنگ کو مجیٚور بزانت هەموا صفرا خوٚ وا ئینای . مجیٚور دگەل هندەك خلمەتکارا تەفسیا بریٚزدکەنو دبیٚژت : گەلی میڤانو خووندییا گەلی جوامیٚرو گوندییا کەرەمکەن سماطیٚ بخوٚن هەر چار پیٚنجەك لدوٚرا تەفسییەکیٚ خرڤەدبن . دخوٚن هەما تیٚر خوارن مجیٚور دروٚزا زادی دبیٚژت ، و پاشی گرارو گوٚشتو سەرکیٚت ماین لناڤ گوندی ل مالا بەلاڤدکەن . سماطە دڤیٚت هەموو کەس ژیٚ بخوٚت ..

پشتی سماطیٚ دخوٚن کچو کوڕ لویٚڤە دراوستاینە چاڤەریٚنی دیلانیٚنە مجیٚوریٚ گوندی ، خوٚ چەندی پیرەمیٚربت ، دیٚ گازی شازبەندیو چەند ری سپییەکا کەتو ب سەریٚ دیلانیٚ گرتو دیلانیٚ ب هلهلاندنو هاوەهاوا خودیٚو خاسیٚ گوندی و بابچاکا گەرمکەت . هیٚدی هیٚدی خوٚرتو کچ ژی دخوشیٚنە ناڤ دیلانیٚ هەتا باش گەرم دبت مجیٚورو هندەك پیرەمیٚر هەر دیٚ زڤڕنە بەر قوبیٚ ..

پشتی روٚژئاڤا خەلك خوٚ دکیٚشنە ناڤ مالا هەر ئیٚكو خووندییٚت خوٚ ، طوافیکەریٚت خوٚ دبەتە مالا خوٚ و هەکە مجیٚوریٚ گوندی ئیٚکی بیانی دیت ریٚبارەك کەسانەك دیٚ بەتە مالە و کەتە میڤانیٚ خوٚو بیٚژتیٚ تو خووندییٚ خاسیٚ گوندی و ییٚ منی .. ]

هەروەکی د ووتارا طوافادا هاتی : [ ل جریدانیٚت سوارا مجیٚور سواریٚ زیخو سوارچاك خەلاتدکەت ] پشتی جریدانیٚت سوارا کو چاخیٚ فراقینیٚیە خوارن لسەر مجیٚوریٚ گوندییە [ مالا مجیٚوری سماط وا کری چەند سەربڕەکو یٚت کوشتین ، دیٚ تەفسی و تەبلیکیٚت گرارو گوٚشتی بریٚزکەن گوندیی و خووندیی لدوٚرا سماطیٚ تیٚنەئیٚك ، بەری بخوٚن مجیٚور سەرکیٚ سماطیٚ د دەستیٚ خوٚ دکەتو دبیٚژت : [ گەلی جوامیٚرا خودان خیٚرا ، سەرکیٚ سماطا ، ناڤیٚ خاسیٚ گوندی دئینت ، جڤاتی ئیٚك دیٚ بیٚژت : بوٚ من ب دەهـ وەزنیٚت گەنمی ئیٚك دیٚبیٚژت ب پەزەکیٚ یان گایەکی و دیٚ پیٚداچن هەتا ب موغدارەکی دسەکنن ، هەو ل ئیٚکودوو رادبن ، مجیٚور دیٚ سەرکیٚ سماطیٚ دناڤ نانەکیٚ کەتو دەتە ییٚ پتر ژ حەموا ل سەرکی رابووی و دبیٚژتیٚ : خودیٚ و خودانیٚ گوندی خیٚرا تەو حازرو گوهدیٚرا قەبوولکەت .

هەرهوٚسا سینگیٚ سەربڕیٚ ژی بە ڤی تەرزی لیٚ رادبن هەتا دگەهتە ئیٚکی و پاشی مجیٚور دیٚ بیٚژت : کەرەمکەن گەلی میڤانو جوامیٚرا . سماطیٚ بخوٚن ، پشتی خوارنیٚ هەرئیٚکو دەرهەمەك پتر کیٚمتر ددەنە مجیٚوریٚ گوندی . و دچنە ناڤ مالا بیٚهنەکیٚ بیٚهنا خوٚ تینن هەتا دیلانا عەسریٚ .. ] چاخیٚ طاوس تیٚتە گوندی ب قەوالڤە دیسا دەوریٚ مجیٚوری گوندی یی بەرچاڤو ئاشکرایە ئەوە ب زمانیٚ گوندییا ب خیٚرهاتنا قەوالیٚت طاوسیٚ دکەت ل قەول گوٚتنو محابەتا ئەوە بەرامبەری مەزنیٚ

قەوالا روودنێت و دبێژتێ بەلێ و لێ ڤەدگێرت ، ئەوە خێرا گوندی یا کۆمدکەت و دسپێرتە قەوالا .. ئەوە سەروگوها ل ڕەوانەکرنا قەوالادکەت .. برێنە ووتارا طاوس گێرانێ .

- جەژنا : هێڤارا جەژنێ مجێور قەستا بەر قوبێ دکەت دروزێ دبێژت و دچتە ناڤ گۆرستانی تەرقینێ لسەر تربا دبێژت . سبەیکێ زوو دیسان قەستا بەر قوبێ دکەت دەری ڤەدکەت ، گوندیێ ژی ب کچك و مەزنڤە ب ژن و زەلامڤە ، بەری بچنە مالێت ئێکودوو عیدانیێ ، ق -ا بەر قوبێ دکەن لێ زیارەتی دبن و دچنە دەستێ خودانی مجێوری و جەژنا وی پیروزیدکەن .. مجێورژی سەربرا عیدێ ب خێرا خودێ و خودانی وا کوشتی و نیڤرۆ فراڤینا زەلامێت گوندی ل مالا مجێوری دبت ..

- رۆژێت جەژنا چلەی - بێ هاڤینێ و زڤستانێ و جەژنا جەمایێ و شەڤبەراتێ ئێزدی قەستا لالشێ دکەن ، مجێورژی لبەر نیشانگەهێت خودانێت خۆ هەر مجێورەك و سەربرەکێ یان پتر دکوژت و رۆژێ دوو جارا ، سبەیکا و هێڤارا ، سماطێ ژ مریدێت خۆرا دکەن . نەخاسمە بەرێ دڤیا مریدا چو خوارن دگەل خۆ نەبربا لالشێ . مریدژی هەرئێك و خێرا خۆ فتوییێ سماطێ ددەنە مجێوریێ و سەرك و سینگێ سەربرێت سماطێ مرید لێ رادبن وەکی چاوا ل طوافا ..

تەڤرو بێرێت زەهمانی کو د تایبەتینە ب کۆلانا گۆرێت مریا ل مالا مجێوری دبن و هەکە ئێکی کراس کهۆری ، چو بەر رەحما خودێ ، دڤێت مجێورێ گوندی بەری هەموو گوندیا قەستا بەر قوبێ یان ئاقدێ بکەت دروزێ بێژت و دەرگەهێ قوبێ ڤەکەت و دەرێ زەهمانی ڤەکەت ئانکو بەری هەمووا دوو سێ تەڤرکا یان قازما ل جهێ گۆرا دڤێن ژ مریرا بکۆلن بدەت ژ نوو پاش هەر ئێك و خێرا خۆ گۆری دکۆلن و مجێور قەولێ سەرەمەرگێ[*] دبەرا دبێژت و پاشی مری دادهێلنە تربێ و هەریا ژ چریاندنا. دەرزێت بەرێت سەرسینگی مری دڤێت مجێور وێ هەرێ بکەت . پێچکێت خۆ پێخواس دکەت و ب دەست سێ جەبالێت کچکۆك ژهەرێ بکەت و دەرزێت بەرێت سەرسینکێ مری دچرپینت و تەرقینێ لسەر دبێژت ..

چاخی بووکەکێ بگوهێزن هەکە بووك ژ گوندەکی دی بوو و ئینانە گوندێ زاڤای یان بووك و زاڤا ژ گوندەکی بوون دڤێت بووکێ بەری ببەنە مالا زاڤای ببەنە بەر خاسێ گوندی زیارەتیکەن و ژنا مجێوری ب طاوا بغووری ڤە دچتە پێشیا بووکێ و ب ڤێ چەندێ فتوییێ خۆ ژ مالا خەزووری بووکێ وەردگرت .

هەکە گوندیێ ژنەکێ بۆ خۆرتەکی بخوازن دڤێت مجێور دناڤ جڤاتێدا بن .

ل هاڤینا دەمێ بێدەر هلگرتنێ مجێور ژ هەر مالەکێ تەنەکەکا گەنمی ب خێرا خاسێ گوندی هلدگرت . ل سەرێ بەهارێ ئێزدی ، گوند ب گوند نەقلا نان و ماستی دبەنە لالشێ گوندیێ هەر مال و تەروونەك دووێت نانێ تەنکی دپێژن و دبەنە مالا مجێوری هەرهۆسا هەر مالەك و ئامانەماکا ماستی هەما نان و ماست کۆمبوو مجێور ب گوندیڤە وی نان و ماستی دگەل سەربرەکێ دبەنە لالشێ و مجێور د پێشیا واندا .

ل پایزێ دیسان مجێور خێرا گوندی کۆمدکەت و تەنەکێت بزری دکرن ، بەرێ بزرێ زەیتوونا بوو نهۆ یێ کونجیایە ، ل مالا مجێورێ کۆم دکەن و پاشی گوندیێ و مجێورێ خۆ بزریێ و فتوی دبەنە لالشێ ژ چراییێت خاس و نیشانگەهێت لالشێرا ..

- ل رۆژێت داوەتنەبیا ، یان هەکە گوندیێ بڤێن خێرەکێ بکەن دێ هێڤاری ، کو بەرێ هێڤارێت چارشەمبووا بوو نۆکە یان چارشەمبووا یان ئینییایە ، مجێور دچتە سەر بانی و ب دەنگەکی بلند باندەت : گەلی ئێزدیا گەلی گوندیا سبەی داوەت نەبیا ... و ناڤێ خاسێ گوندی یان کا داوەت نەبیا کی خاسیە ناڤێ وی دبێژت ، ب ڤی ئاوای سێ دەنگا باندەت هەر دەنگەکی بەرێ خۆ ددەتە کنارەکی بەرەو لالشێ هەڤراز بەرەو رۆژهلات و رۆژئاڤا . گوندیژی هەما گوهداریا دەنگێ مجێوری بکەن هەکە دروونشتیبن ئێکسەر رادبنە ژپێرڤە و بەرێ خۆ ددەنە لالشێ و هەردوو دەستێت خۆ لسەر ئێك دادنێن . هەما مجێوری سێ دەنگا باندا گوندیێ دێ ناڤێ خودێ و طاوسیمەلەك و شێشمس ئینن ، و ل گریڤانێ خۆ زیارەتی بن .. رۆژا دی کەس ناچتە چوو شۆل و کارا ، سبەیکێ هەر ئێك و شیان و هەیا خۆ یێ مریشك یێ کارك ، بەرخك سەربرەکێ ب خێرا ناڤێ خودێ و خاسێ داوەتنەبیا وی دکوژن و کابانی دێ گرارەکێ لێنێت و هەر مال تەبلیەکە گرار و گۆشتی بەنە بەر قوبێ و فراڤینا خۆ لێ دخۆن .

ل رۆژێت بان هنووتنێ یان خلمەتەکە هێرڤە وێڤە گوندیێ زبارێ ژ مالا مجێوریرا دکەن . هەرهۆسا هەر دانێ سالێ جارەکێ هەر مال و بارەکی قۆلکا یان دارك و چلوی بۆ قەهوا کۆچکا مجێوری دئینن . هەکە کیژەك ل گوندی دانە شوو چەند دینارەکا ژ قەهوا کۆچکا مجێورێ گوندیرا ژ بابێ زاڤای وەردگرن ..

ئاشكرایە بیر و تەكبیرو تەرزێ ژیانا نهۆ ئێكجاری وا گهۆڕی ؛ خوندەوار ، دختۆر و دەرمانێت ئیشا شوكر دزاڤن . لێ بەرێ هەكە هەر دەڤەرەكێ حەكیمەك هەبا یان نە !! پیرەمێرێت مە د بێژن تێتە بیرا مە ل دەڤەرا مە حەمووكێ ئانكو ل وەلاتێ شێخ بەس حەكیمێ گوندێ جەرەحیێ هەبوو ، لێ ل گوندێت مە هەبوون دگۆتنێ چاڤرۆن .

یان كۆچەك ، هەكە ئێك نەساغ با یان بەرنگاری تەنگاڤییەكێ با لسەر ئەینەتا خۆدێ قەستا كوچەكەكی كربا ئەوی ژی پشتی سەری خۆكێ دادنا دێ بەرێ جوامێری دابا خاسێ فلان گوندی . جوامێرژی لسەر ئەینەتا خۆب دلەكی پڕ هیڤی قەستا مجێوریێ وی گوندی كرباو خۆ هاڤێتبا خودێو خودانێ مجێوری كو دەرۆكێ خێرێ لێ ڤەكەتو تەنگاڤیێ لسەر بشەقتینت ..

ڤێجا بۆ هەر ئێشەكێ ، تەنگاڤییەكێ بەرێ خۆ ددانە خاسەكی . هەتا نوكە ژی هەكە سالەكا كێم ڕێژی بت باران‌و نختە یە سست بت دەخلودان چاندنی تێنی بن ئێزدی ل كۆچكا مالا مجێوری خێرێ كۆمدكەن‌و سەربڕەكێ دكڕن و قەستا [ پیری مەحمەرەشان ] دكەن ل دولكێ چیایێ مەقلوبی دسەر مووسلڕا .

ب ڤێ بۆنێ ئیسال زڤستانە كێم ڕێژی بوو دەخل و زەڤی كزرین ژ تێنا ، دیسا چەندەها گوندێت ئێزدیا قەستا بەر پیرێ مەحمەرەشان كرن . هەر چاوا بت‌و خوندەڤانێ هێژا چاوا شرۆڤەبكەت ڕۆژا پاشتر ژ كەرەما خودێ وەكی دبێژن بارانەكا باش باری ..

هەكە ئێك زكێ وی ب ئیشت قەستا مالا مجێوری بابادین دكەت كو ژ شێخێت شەمسانە . هەكە تای هاتبانە ئێكی و دلێ وی رابا دێ گۆتبانە كێما هەیڤێ وێ گرتی دبرنە مالا بابێ شێخ ژ شێخێت فەخرا هەكە چاڤێت ئێكی ئیشابانە یان هەستیێ لەشێ وی باوی با یان دوپشكی پێڤەدابا قەستا مجێوریێت پیرێ جەروا دكرن هەكە ماری ب ئێكی ڤە دابا قەستا شێخێت شێخمەند دكرن . هەكە بای بسەر ئێكی بكەڤت‌و مەژیێ وی سڤك بت دبەنە مالا مجێوریێت هاجیال ل بەعەدرێ هەكە وەكی دبێژن جن كەهشتبانە ئێكی دبرنە بەر شێشمس . هەكە ئێكی بەختێ وی ئالۆزو وەركەریای با مرازا ویە دووربا قەستا مجێوریێت شێخ حەسەن دكر .. هتد ..

ڤێجا مجێوریێت گوندا هەتا ڤان سالێت دمایكێ ژی قەستكەها بێزارو تەنگاڤ‌و نەساغا بوون .. ب دەها دلمای د گوندیدا پێكدئینان ، دلێ وان لێكخۆشدكر لسەر خاترا مجێوریێ گوندی هەكە كەڤتبا نیڤەكا دلمایا دێ ئاشتبانە . چونكو ل گوندیا گەلەك بارگرانی و زەحمەت بوو هەكە هیڤیا مجێوریێ بەرێ خۆدابیێ ب جهـ نەئینابانە .

ل سالێت دمایكێ مجێوریێت گوندا وەكی بەرێ گەلەك ل دوو ماشێت خۆ ناگەڕێنەو زارۆكێت وان مینا باب‌و باپیرا خۆ فێری قەول‌و قەسیدا ناكەنە . لێ هێشتا دەورێ مجێوریێ ل گوندێت ئێزدیا د خێرو شەڕادا دخۆشیی‌و نەخۆشییادا دەورەكی بەرچاڤە . پایە و بەهایێ خۆ د ژیانا وان یا كۆمەلاتیدا یێ مای ..

**پەراوێز :**

**ئەڤ زانیارینە لسەر مجێوریێ گوندی من ژ ئەنجامێ ژیانا خۆ دناڤ گوندێت ئێزدیادا كو ئەز ژی ژ بنەمالا مجێوریێت پیرێ جەروانم و ژ ئەنجامێ پرسین ژ چەندەها مجێورا وەكی رەحمەتیێ پیر مەرعان مجێوری ئێسفنێ‌و رەحمەتی پیر عبدوێ مامێ من‌و برایكێ من پیر خەلیل كو مجێوریێت پیرێ جەروانن بەر ئێكڤە ئینان .**

*** مجێور : ئەڤ پەیڤە لێكدراوە ژ پەیڤێت : ما جی وار ئانكو مای ژجهێ وارێ ئانكو ژبنەمالا ..**

**1 – طوافێت ئێزدیا ووتارەك بوو ب زنجیرە دروژناما هاوكاریدا هژمارە « 538 » و « 539 » ل سالا 1980 ز . هاتە بەلاڤ كرن .**

**2 – طاوس گێران : دكوڤارا رۆشنبیری نوی‌دا ژمارە « 101 » سالا 1984 هاتە بەلاڤ كرن .**

**3 – اليزيديون في حاضرهم وماضيهم ص 140 – 141 ـ السيد عبدالرزاق الحسني**

**4 – چاڤپێكەڤتنەك دكەل پیر مەموێ مجێوریێ موسلمان لروژا 984/3/6 .**

**5 – چاڤ پێكەڤتنەك دكەل كۆچەك سلیمانی ئێسفنی كو ژپیرێت خانی‌یە ژیێ وی 70 سالە .**

**6 – رەنجبەری ل كوردستانێ . كۆڤارا بەیان هژمارە 64 سالا 1980 ز .**

**7 – بابێ شێخ : ئەختیارێ مەركەهێ ژبنەمالا شێخێت فەخرەدین كوڕێ ئێزدینە میرە . من ئەینەتە ووتارەكاتایبەتی لسەرڤێ بابەتی بنڤیسم .**

**8 – قەولێ سەرە مەركێ : دناڤ ووتارەكا تایبەتی دا دێ بەلاڤ بت لبن ناڤێ كراس كهۆڕین . قەولەكێ درێژە بەس لسەركۆڕا مری دبێژن .**




# جیۆلۆجیای پلانێتەکان

« Planetary Geology »

ڕێبوار حسن محمد

جیـۆلۆجی بەمـانا زەویناسین ، زانستێکـە لە زەوی دەکۆڵێتەوە بە هەموو ئەو ماتەرانەی وەك چینەکـەفرەکـان ، پەترۆل ، ئاوی ژێرزەوی و گەلێك سامانی سروشتیدی ، ئەو پـروسێسانـەی کاریـان کردۆتـە سەرگـۆی زەوی لە چـاخـە جیۆلۆجیە هەرە دێرینەکانەوە تاکو ئێستا .

مەیدانی ئەم زانستە گەلێك فراوانە لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیاو تەکنیکی نوێدا بەهاوشانی زانستەکانی دی پێش دەکـەوێت . زانست لەبارەی کـۆمەڵەی خـۆرەوە Solar system هەنگاوی بەگوڕی ناوە . جیۆلۆجیاش لەم ڕووەوە جێگای خۆی کـردوەتەوەو ڕووی کـردۆتـە دەرەوەی گـۆیزەویو بـەرەو کـۆمەڵەی خـۆر ، جیولۆجیـای پلانێتـەکان پێکهـاتوە . ئـەم لێکۆڵینەوانەش بەدەستکەوتنی نموونەی کەڤروگلی سەرڕووی پلانێتەکان گەشەی سەندووە .

بۆ ئەوەی زیاتر لەم بارەیەوە بدوێین ، سـەرەتا بـاسی ڕێگای لێکۆڵینەوەکانی پلانێتو مانگەکانی دەکەین . ئاشکرایە دوای سەدەی بوژانەوە لەئەوروپا زانستی جیۆلۆجیـا هەنگـاوێکی نوێینا ، چونکە زانست پێش ئەو کاتە لەبارەی پلانێتەکانەوە تێڕوانینێکی سەرپێیی بوو .

لەسەدەی شانزەهەمدا ولیام گلبێرت (1542 — 1609) بەبێ بەکارهێنانی تەلیسکۆب یەکەم نەخشەی ڕووی مانگی بۆ شاژن ئیلزابێس (Queen Elezabethl) کێشا . دوای ماوەیەکی کورت ساڵی 1609 تەلسکۆب دۆزرایەوە . گالیلۆ گالیلی (1564 — 1642) یەکەم کەس بوو تەلسکۆبی بۆ لێکۆڵینەوەی مانگ بەکارهێنا ، بەستنی کامێراش بەتەلسکۆبەوە وێنەگرتنی مانگو پلانێتەکانی ئاسان کرد .

ئەو زانیارییەی لەم ڕێگایەوە دەستمان کەوتووە ئەوەیە کە زوحەل Saturn زنجیرەیەك ئەڵقەی گازیو نبتۆن Neptune تەنها ئەڵقەیەکی ڕوو ناکی نیشان دەدات . لێکدانەوەی قەبـارە ، خولگەو سیفەتی پلانێتـەکان کـارێکە لە تـوانای زانستـایە ، لەحسـاباتی خـولگەکـانیانـەوە بارستـایی ، لەبـارستـاییەوە تیرەکانیان وئنجا چڕیو لەمیشەوە پێکهاتووی ناخی پلانێتەکان دەردەهێنین .

ئەسترۆ نۆمییەکان (فلکییەکان) پلانێتەکانیان کردووە بە دوو بەشەوە . یەکەمیان پلانێتەکانی ناوەوە Inner Planets بچوکن ، چڕیان زۆرە ، خێرایی سورانەوەیان کەمەو ژمارەیەکی کـەم مـانگیان هـەیە ، چـڕیـان لەنیـوان 3,97 — 5,52 دایـە ، ئـەم کۆوومەڵەیە عەتارد Mercury زووهرە Venus ، زەوی Earth مەریخ Mars دەگرێتەوە .

دووەمیان « دەرە پلانێتـەکانـە » Outer Planets « چڕیـان کەم (0,717 — 1,655) خێرایییان زۆرو بەقەبارە گەورەن . موشتەری



وێنەی ئەسترۆنۆمی ئەمریکی لەسەر ڕووی مانگ

upiter ، زوحەل Saturn ، ئۆرانۆس Uranus ، نبتۆن Neptune ، بلوتۆ Pluto دەگرێتەوە . ڕێگای دی بۆ لێکۆڵینەوەی پلانێتەکان شیکردنەوەی شەبەنگەکانیانە Spectroscopic Analysis) ، تەلیسکۆبی ڕادیۆیی Radio Telescope و ڕاداری بنێرو وەرگر Radar Transmitter — Reciver بەکار دەهێنرێت .
لەو ساتەوەی پێمان ناوەتە ناو سەدەی سپەیسەوە Space Age ڕۆژ دوای ڕۆژ زانیاریمان زیاد دەکات . ڕۆکێتی ئێستاو تەکنۆلۆجیای لێکۆڵینەوەی سپەیس بە ناردنی مرۆڤ و ئامێر بۆ سەر ڕووی مانگ و هێنانی خۆڵ و کەڤر لەلایەن وڵاتانی پێشکەوتووی وەك ئەمریکاو سۆڤیەت گەورەترین سەرکەوتن لەم مەیدانەدا پێکهات .

مەزنترین چرکەی درامی لە مێژووی زانستدا لەبەرواری (20 — 8 — 1969) دابوو کە ئەسترۆنۆمی ئەمریکی نیل ـ ئەی ئارمسترۆن Neil — A . Armstrong پێی خستە سەر ڕووی مانگ .
مانگ یەکەم تەنی ئاسمانی نزیك زەوییە و بەخۆشکە پلانێتی دادەنرێت . چری بەرگی هەوایی (ئەتمۆسفیر) مانگ 1/100 000 بلیون چری ئەتمۆسفیری زەوییە ، واتە مانگ بێ ئەتمۆسفیر ، بێ ئاو وباران و سەهۆڵە و بێ باشە ، لەبەر ئەمە کرداری کەشاندن Weathering داڕوتان Erosion بەدەگمەن و کەمە هەربۆیە وایان داناوە کەجێگە پێی ئارمسترۆن لەسەر ڕووی مانگ تاکو دە بلیۆن ساڵی دی دەمێنێتەوە ، هەرچۆنێك بێت کرداری کرانـدن وداماڵین زیاتر بەهۆی ساردی وگەرمیو جووڵەی ڕیگۆلیسە وە Regolith دەبێت .

تەلیسکۆبەکەی گالیلۆ ڕووی مانگی بەتاریك و ڕووناك پیشاندا . گالیلۆ ڕووە تاریکەکەی بە ئۆقیانوس Maria وڕووە ڕووناکەکەی بەبەرزایی High land دانا . لەسەر ڕووی مانگ کونی نیمچە بازنەیی گەورە دەبینرێت ماوەی نێوانیان دەگاتە 1,5 کیلۆمەتر یان کەمتر . ئەم کونانە بریتین لەدەمی ڤوڵکانی Volcan کۆن یان جێگە چاڵی بەرکەوتنی ئەیزەك Meteorites .
ئەو کەڤرانەی لەسەر ڕووی مانگ کۆکراونەتەوە بریتین لە سێ جۆری کەڤری ئاگرین Igneous Rocks ئەمانەن : ـ
1 — کەڤری بازاڵتی Basaltic Rock
2 — کەڤری کریپ نۆرایت Kreep — Norite Rock
3 — کەڤری ئەنۆرثۆسایت Anorthosite
جۆری سێیەمیان لە شوێنە چاڵەکانی ماریا لە بازاڵت بڵاوترە ، ناوچە بەرزەکانیش بریتین لە کریپ نۆرایت .
بازاڵت و کریپ نۆرایت پێکهاتوون لە ئەنجامی پرۆسێسی نیمچە تواندنەوە Partial melting ی ناخی مانگ ، ئەنۆرثۆسایت لە ئەنجامی جیابونەوەی کریستاڵی Crystal Fraction ئەمەش کاتێك دەبێت کریستاڵی کانزا قورسەکان ئەنیشن ونقوم دەبن کریستاڵی کانزا سوکەکانیش بۆ سەرەوە ڕەو دەکەن .
ئەگەر توێژی مانگ لە ئەنجامی جیابوونەی کریستاڵی Crystal Fraction پێکهاتبێت ئەوایەکەم جار ڕووی مانگ بە لاڤا Lava داپۆشراوە ، مادەی لاڤاکە ساردبۆتەوە کانزاکانی بلاجیۆکلیس Plagio clase سەرکەوتۆتە سەرەوەی ڕووی توێژ . کانزاکانی دی وەك ئاسن ، مەگنیسیوم بۆژێرەوە . کریپ نۆرایت کە بە کرداری نیمچە شل بوونەوەی ناخی مانگ وچالاکی ڤولکانی Vol-canic Activity دروست بوون ، پێکهاتوون لە پۆتاسیۆم ، فۆسفۆر ، باریۆم و توخمە بەدەگمەنەکان ، یورانیوم لەشوێنە بەرزەکاندا . هەروەها ریگۆلیث Regolith ودیبریس Debris لە

ئەنجامی بۆردومان کردندا بــە نیازك وتیشکــە گەردونیــەکان دروستبوون .

ناخی مانگ : ـ ڕووی مانگ گەرمایی لە ڕووی زەوی زیاترە ، بەقولایی 25 — 70 کیلۆمەتر چونیەك نیە . گەرمایی ناخی مانگ ئەگاتە گەرمی توانەوەی کەڤری سەروو تفت Ultra Basic Rocks بەلام لەخوارەوەی توێژی زەوی وبەشی سەرەوەی مانتڵ Mantle ئەتوێتەوە مادەی ماگما Magma ی زەوی بەشیوەی نیمچەشل کە بەهاتنە دەرەوەی ڤۆلکان پێکدێت دروست دەکات . کایەی موگناتیسی مانگ زۆر بێهێزە ، پاشمــاوە موگنــاتیسی Residual Magnetism کەڤرەکان دەری‌دەخەن کایەکە بەهێز بووە بــەر لە نزیکەی 3,2 — 3,9 بلیۆن ساڵ .

تــوێژی مــانگ تــاکو قــولایی « 1000 » کیلۆمەتــر ڕەقــە واتــە لیثۆسفیری Lithosphere ئەستورو ئەستنۆسفــری Asthenosphere نیمچــەشل وکــرۆکیشی ڕەقە وەك لەوێنــەکەدا دیــارە چالاکی بوومەلەرزە کەمو بێهێزە دەگاتە نزیکەی یــەك بۆ دە ملیــۆن هێزی بوومەلەرزەی زەوی ، ئەمەش کاتێك ڕوو دەدات مانگ نزیك‌بێتەوە لەزەوی .

**مانگ چۆن پەرەی سەندووە ؟!ـ**

کۆنترین کەڤری مانگ تەمەنی 4,5 بلیۆن ساڵە ، تازەترین کەڤریشی تەمەنی 3,1 بلیۆن ساڵە کە تاکو ئێستا لەسەر ڕووی مــانــگ دۆزرابێتــەوە . ئــەمــەش دەری دەخــات مێــژووی پەرەسەندنی مانگ لەماوەی نزیکەی 1,5 بلیۆن ساڵدا بــووە . مانگ وکــۆمەڵەی خــۆر هەمــان بنەچــەیان هــەیە . مێــژووی ســروشتی مۆرفــۆلۆجی مانــگ دەتوانــین بکــەین بــە شــەش قۆناغەوە .

یــەکەم : ـ لەم قــۆناغــەدا مانــگ بوو بــە بارستــە تــەنێکی سەربەخۆ ، گەرمایی ناخی مــانگ بــووە هۆی تــواندنــەوەی کرۆکەکەی .

دووەم : ـ کــەڤرەکــان Rocks بەگــوێرەی چــڕییان بــۆ چینی دەرەوەی سلیکاتی و کرۆکی ئاسنی ناوەوە جیابونەوە . توێژی مــانگ بــەهۆی چــالاکی ڤۆلکــانی‌یەوە پێکهــاتوە لە کــاتێك‌دا کۆبوونەوەی کریستاڵی دروست‌بوو .

سێیەم : ـ لەم قۆنــاغەدا کــریپ‌نۆرایت بــەکرداری نیمچــە تواندنەوەی Partial Melting چینە کــەڤرەکــانی خوارەوەی تــوێژ پێکهات .



« وێنەی جێگە پێی ئارمسترۆن لە سەر ڕووی مانگ »

چوارەم : ـ لەم قۆناغەدا ڕووی مانگ بەپارچەی پلانێتەکانی دی بۆردومان بوو چاڵی گەورەی تیا پێکهات ، ئایزۆتۆپی Isotopes کەڤرەکان دەری‌دەخەن کە ئەمە 4 بلیۆن ساڵ بەردەوام بووە .

پێنجەم : ـ دوای بۆردومانە چڕەکەی قۆناغی چوارەم ووردە ووردە کەم بوەوە . چالاکی ڤۆلکانی بۆ مــاوەی بلیۆنێــك ساڵ بەردەوام بوو .

شەشەم : ـ لەم قۆناغەدا مانگ بەگشتی باڵی هێمنی و ئارامی دایپۆشیبوو . چاڵەکانی ماریا کە لەئەنجامی بۆردومان کردن دروست‌بوو بوون بەبێ کارتێکردنی کەشــاندن وداڕوتــان یان داماڵین هەروەك خۆیان بەلووسی مانەوە تاکو ئێستا .

هەروەکو بــاس‌کرا پــلانێتەکــان بوون بــە ناوە پــلانێتەکــان‌و دەرەپلانێتەکان . ناوە پلانێتەکان لەبەرئــەوەی هەمــان چڕی زەوییــان هەیــە بە (پــلانێتــەکــانی زەوی) ش نــاودەبــرێن . سەرەرای زەوی ومانگەکەی ئەم پلانێتانەش عەتارد ، زوهرەو مەریخ دەگرێتەوە .

« عەتارد »

تا مارینەر 10 ساڵی 1974 زانیاریمان لەبارەی عەتاردەوە کەم بوو . ڕووی عەتارد لە تەلسکۆبەوە تاریکــە . نزیکتــرین



وێنەی ڕوی عەتارد کەمارینەر 10 لە 1974/3/29 دا گرتویەتی

پلانێتی خۆرە ، دانەوەی ڕووناکی لەسەر ڕووەکەی بینینی گران کردوە . گەرمترین پلانێتە گەرمایی ڕوژانەی دەگاتە 425° س . زانایان تاکو ئێستا لەو باوەڕەدان ڕوویەکی ڕووناکو گەرمە ئەوی دی تاریکو ساردە . ئەتموسفیری عەتارد تەنکە ، چڕی دەگاتە یەك بۆ سەد بلیونی ئەتموسفیری گۆی زەوی . بێ ئاو و ژیانە ، زۆربەی ئەتموسفیرەکەی هیلیومە . وێنە فۆتۆگرافیە بەرزەکانی مارینەر 10 پیشانی دەدەن کە ڕووی عەتارد بێژراو-کون کونە وەك مانگ بەلام ئەم چاڵ و کونانە Crater لەسەر ڕووی عەتارد ماوەی نیوانیان زیاترو لووس ترن ، کاری داماڵین و داخورانیان بەسەرەوە نەبوە یان زۆر کەم تر بووە وەك لە مانگ ، وە هەروەها دەمی چاڵەکانیش بچووکترن .

بۆمباران لە لایەن پلانێتە سەرەتاییەکانەوە کە بەر عەتارد کەوتوون زۆر دوور نەبوون وەك مانگ چونکە هێزی کێش‌کردنی دوو ئەوەندەی مانگە .

دیاردەی lobate Scarps لەسەر ڕووی بەهۆی چالاکی تکتۆنیەوە بوە ئەمەش کاتێك کرۆك بەرەو ساردبوونەوەو کرژبوونەوە ڕۆیشتووە بەدی دەکرێت .

کرۆکی عەتارد وەك زەوییە ، تەزووی بار هەڵگر Convection Current بەڵگەیە بۆ بوونی توێژی تەنك لەگەڵ مانتل . کرۆکە ئاسنەکەی تیرەی 3/4 تیرەی عەتارد خۆیەتی ، واتە قەبارەی کرۆکی دەگاتە قەبارەی مانگ .

کایەی موگناتیسی گونجاوی هەیە لەگەڵ تەوەرەی سوڕانەوەی هێزەکەی نزیکەی 1/100 ی هێزی موگناتیسیەی زەوییە . خێرایی سوڕاندنەوەی هێواشە ، واتە کایە موگناتیسیەکەی بەهۆی کرۆکە شلەکەیەوە پێك نەهاتووە .

چونکە چالاکی تکتۆنی نەماوە هەروەك چۆن زانایان تیا ڕاماون لە زوهرەدا بە نەبوونی کایەی موگناتیسی هەرچەندە کرۆکی گەورەو شل و گەرمی هەیە .

یەکێك لە گرنگترین دیاردەی نەگونجاوو چاوەڕوان نەکراو لەلایەن مارینەر 10 وە خولقێنرا کە مێژووی پەرەسەندنی عەتاردو مانگ نزیکن ، بەم شێوەیە مێژووی عەتاردیان کردووە بە پێنج سەردەمی جیاجیاوە .

**یەکەم :-**

لەم سەردەمەدا کرۆکی ئاسنی جیابۆتەوەو دەورەدراوە بە ماتەری سلیکاتی مانتل بە هۆی کرداری بەش بوونی کیمیاوی Chemical Fraction .

**دوەم :** - لەم سەردەمەدا چالاکیە فۆلکانیە کۆنەکان و بۆمباران کردنی لە لایەن پلانێتە ناوەکیەکان دەستی پێکرد .

**سێیەم :** - لەم سەردەمەدا بۆمبارانی چڕو پڕ دەستی پێ کرد لە ئەنجامدا چاڵ ، کون ، حەوز Basin لەگەڵ بەرزی و نزمی بەشێوەی دۆڵ و چیا پێکهات .

**چوارەم :** - لەم سەردەمەدا چالاکی فۆلکانی فراوان و بلاو چالی قول و فراوانی وەك چاڵەکانی ماریای مانگی پێکهێنا .

**پێنجەم :** - لەم سەردەمەدا ئارامی و سرەوتێك عەتاردی گرتەوە لە چاو چوار سەردەمەکەی پێشو ، بەم شێوەیە سێ بلیۆن ساڵەی دوایدا هیچ جۆرە چالاکیەکی تکتۆنی ڕووی نەداوە .

**زوهرە :** - چڕی ئەتوسفیری زوهرە 100 ئەوەندەی ئەتموسفیری زەوییەو ، پێکهاتووی سەرەکی کاربۆن دایئۆکسایدە . جوڵەی خێرای بەشی سەرەوەی ئەتموسفێرو پێکهاتووە ئەسیدیەکەی بۆتە بناغەی ئەو ئایدیایەی کە دەڵێت ڕووی زوهرە کاری داخورانی کیمایی گەورەی لەسەرە .

بەلام کاتێك کەشتی ڤینرا 9 ی سوڤیەتی (venera 9) لە ساڵی 1975 دا چوە بەربەستە ئەستورە زەردەکەی زوهرەوە وێنە فۆتۆگرافیەکان تەڵەزمە بەردی تیژی کە درێژیان ئەگەیشتە 50 سم لە جیاتی ڕوویەکی ڕێك دەرئەکەوت کە ئەمەش لەوەپێش چاوەڕوا نەکراو بوون . نەبوون و دەرنەکەوتنی کاری داخورانی کیمیاوی لەسەر تەڵەزمە بەردەکان دەری دەخەن کە ئەم بەردانە تارادەیەك تانەن ، هەرچەندە وێنەکانی ڤینرا 10 [ Venera 10 ] بیرۆکەی داخوران لەسەر خڕکە کەڤرەکان Rounded Rocks دەچەسپێنێت .

لە مانگی دوانزەی ساڵی 1978 شەش عەرەبانە ئاسمانیە ئەمریکیەکەی پایۆنیری زوهرە گەیشتە ئەتموسفێر بەلام چواریان گەیشتە سەر ڕووی زوهرە . هەروەها عەرەبانە

ئاسمانی یەکانی پایۆنیری سۆڤیەتی پێش ئەوەی مل کەچی ئەو بارو دۆخە نالەبارە ببن لە پاڵەپەستۆو گەرمی (پاڵەپەستۆی هەوای زوهرە سەد ئەوەندەی زەوییە) زانیارییەکی زۆری گەیاند بە زەوی .

ئەوەی شایەنی باسە ڤینرا 9 و 10 دوای یەك سەعات لەسەر رووی زوهرە لەناردنی وێنەی فۆتۆگرافی کەوتن روون بووەوە زوهرە ژیانی تیا نی یە .

سەرەڕای ئەوەی کە کاربۆن دایئۆکسایدو سولفەریك ئەسید پێکهاتووی سەرەکی ئەتمۆسفیرن . ئەرگۆنیش بە ئەندازە ـ یەکی چاوەڕوان نەکراو دەردەکەوێت .

بونی ئەرگۆن و ئایزۆتۆپی بنەڕەتی ئەرگۆن بەڵگەیە بۆ ئەوە کە بنەچەی زوهرەو ماتەرەکان لەیەك کاتدا بوون زوهرە لەچاو گۆی زەویدا 42 ملیۆن کیلۆمەتر لەخۆرەوە نزیکترە ،، زووربەی گەرمای خۆر بە هۆی ئەتمۆسفیرەوە د[illegible]ت جێی سەرسوڕمانە کە زوهرەو زەوی پلەی گەرمیار [illegible] جیاوازە هەرچەندە ئەمەش ناگەڕێتەوە بۆ نزیکی لە خۆرەوە بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مادە نەگەیەنەرەی کە ڕێگای دانەوەی گەرمی نادات ، ئەم مادانەش وەك هەڵمی ئاو ، نایترۆجین و کاربۆن دایئۆکساید .

دەرکەوتوە کەوا زوهرەو زەوی زۆر جیاوازن هەرچەندە هەردوکیان هەمان قەبارە ، بارستایی هێزی کێش کردن و چڕیان هەیە . هەردوکیان هەمان بەرگی بەردینی دەرەوەو کرۆکی شلیان هەیە بۆیە لە پێشدا پێیان دەوتن «دوانەی کۆمەڵەی خۆر» «Twin of solar system»

## مەریخ «Mars»

کەشتی ئاسمانی ئەمریکی ڤیکین 1 «کە مرۆڤی تیادانەبوو» لە 1976/6/26 دا لەسەر مەریخ نیشتەوە ، دوای تێپەڕبوونی حەوت ساڵی تەواو بەسەر ئەو ڕۆژەدا کە ئارمسترۆن پێی نایە سەر مانگ . لەپاشدا کەشتیە ئاسمانیەکانی دی لەسەر مەریخ نیشتنەوە وزانیارییان ئەنارد بۆ زەوی .

دەرکەوت ئەتمۆسفیری مەریخ هەڵمی ئاوی تیادایە ، هەندێ هەوری پێکهێناوەو ڕۆژانەو وەرزانە باهەڵدەکات . لە نیوە گۆی باشووردا لە نزیك بوونەوەی مەریخ لە خۆرەوە لە بەهاردا ڕەشەبایەکی بەهێز هەڵدەکات خێرایی دەگاتە 250 کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا ، تۆزو خۆڵ دەگاتە ئەتمۆسفێر .

چڕی ئەتموسفێر دەگاتە 100/1ی چڕی ئەتمۆسفیری زەوی لە 95,5٪ کاربۆن دایئۆکساید ، 2,5٪ نایترۆجین 1,5٪ ئەرگۆن ، 0,1٪ ئۆکسجین لەگەڵ ئاو ، کریپتۆن ، زینۆن ، نیون وهیلیۆم پێکهاتووە .

ڕەنگی سووری مەریخ لە ئەنجامی کەشاندنی ئەتمۆسفیری و بە ئۆکسیدبوونی بەردە سەر هتاییە کریستالیەکانیەوەیە . ماتەرەکانی ڕووی مەریخ تووشی داخورانی بابوون لەگەڵ گەلێك پرۆسێسی نیشتن بەلام کاری کەشاندنی ئاوی نیە وەك لەسەر گۆی زەوی ڕوون و ئاشکرایە چونکە ئاوی مەریخ بە شێوەی سەهۆڵ و هەڵمی ئاو دەردەکەوێت ، هەرچەندە وێنە فۆتۆگرافیەکان دەری دەخەن کە ئاوی ڕۆیشتوو تەنها جارێك فاکتورێکی گەورەی داخوران و داڕوتان بووە .

لەکاتێکدا ئاوهەوای مەریخ شێدارو گەرم بووە ، ئاوی ڕۆیشتوو لەگەڵ لافاودا بۆتە هۆی داخوران و داماڵران ئنجا نیشتن لە ئەنجامدا کەندی فرەڕێبازگە Braided channels و Tear-drops islands پێکهاتوون .

سایسموگراف «ئامێریکی جیوفیزیاییە بەکاردێت بۆ دیاریکردن و تۆمارکردنی شەپۆلی بوومەلەرزە» دانرا لەسەر ڕووی مەریخ هیچ چالاکیەکی بوومەلەرزەی دیاری نەکرد بەم شێوەیە هیچ چالاکیەکی تیکتۆنی نوێ نیە .

ڤۆلتی بارستەیی «ڤۆڵت بە مانا شکاندنی چینە کەڤرەکان و داچونیان یان بەرزبوونەوەیان واتە جولەیەکی نسبي تیایاندا ڕوودەدات» وە دۆڵی ڤۆلتری لە گراند کەنیونی (واتە دۆڵی قوڵی تەسك) ئەمریکی پێکهێناوەو ، ئەم چالاکیە تکتۆنیە بەر لە 2,5 بلێون ساڵ کۆتایی هاتوە .

سەرەڕای ڕەنگە سورە دیارەکەی ، هەردوو پۆڵەکەی بەبەفر لەگەڵ تۆز داپۆشراون ئەم دیاردە گرنگە دوای ساردبوونەوەی ئەتمۆسفیرە گەرمەکەی و کۆبوونەوەی بڕێکی گەورە لە هەڵمی ئاو پێکهاتووە ئەم ساردبونەوە کاتێك بووە ئامۆنیاو میثان لە بەرگە هەواییەکەی لابراون ، لە ئەنجامدا ئەو بەربەستە گەورەیەی کە ڕێگای تیشکدانی دەگرت نەماو پلەی



وێنەی پارچەسورە گەورەبەناوبانگەکە لە سەر ڕووی مشتەری



وێنەی تەواوی ئایۆکە ڤویجەرێك گرتویەتی (1979/3/1)

گەرمایی بەرزکردەوە . ئاوی بەستوو لەگەڵ کاربۆن دایئۆکساید لەناو درزو بۆشایی وکەلێنی بەردە تەڵەزمیە ووردو خاشەکانی توێژی مەریخدا جێگیربوون و دوای تواندنەوەیان لافاوی لەسەر هەموو ڕووی مەریخ پێکهێنا . هەردوو نیوەگۆی مەریخ مۆرفۆلۆجیای دیاریان هەیە . نیوەگۆی باشور یان جۆگەو دووڕیان و کونی زیاترو چڕترە لەچاو نیوەگۆی باکووری . دیاردەکانی نیوە گۆی باشوری لە کاتێکی زوو یان سەرەتای بۆمبارانی پلانێتەکانی ناوەوە پێکهاتووە کە لە «4,5» بلیۆن ساڵ لەمەوبەر دەستی پێکردووە «4» بلیۆن ساڵ لەمەوبەر وەستاون . هۆی لووسی و کەمی چاڵ و کون لە نیوەگۆی باکوردا بەهۆی کاری لافاوی لاڤا Lava flooding و وەستانی بۆمبارانەوە بووە .

کەڤرەکانی مەریخ جیاوازن لە بازاڵتەوە بۆ بریشیا «Breccia» «بەردێکە لەپارچە بەردی تەڵەزمی تیژ پێکهاتووە کە بەماتەری لکێنەری وەك کاربۆناتی کالیسۆم یان ماتەری ئاسن و مەگنیسیوم یان هەندێ ماتەری تر پێکەوە بەستراون» کە هەموویان کەڤری ڤۆڵکانین ڤیکینی یەکەم نیشتەوە لە شوێنێکدا پێی دەوترێت Chry planitia کە لە شوێنە چاڵە تاریکەکانی مانگ دەچوو . ڤیکینی دوەم لە utopiaplanitia نیشتەوە ، کەڤرەکان وتۆزە نیشتوەکانی ئەم ناوچەیە بەهۆی باوە جوڵابوون .

**پلانێتە دەرەکی یەکان :**

پێنج پلانێتە گەورەکە مشتەری ، زوحەل ! ئۆرانۆس ، نبتون ، بلوتۆ دەگرنەوە . کەشتی ئاسمانی لەم دواییەدا گەیشتە مشتەری وبەرەو زوحەل بەڵام زانیاریمان لەبارەی پلانێتەکانی دی کەمە .

**مشتەری :**

گەورەترین پلانێتی کۆمەڵەی خۆرە ، بارستەی دوو ئەوەندەو نیوی هەموو پلانێتەکانی ترە هەر بەهۆی ئەم بارستە گەورەیەوە ئەتمۆسفیری بنەڕەتی خۆی هەیە بەپێچەوانەی پلانێتە بچوکەکانی ترەوە کە هێزی کێش‌کردنیان زۆر کەمە ، گازە سوکەکانی ئەتمۆسفیری بنەڕەتی چونەتە دەرەوەی ئاسمانی مشتەری .

لە ڕاستیدا چڕی مشتەری بەڕێژەی بارستەکەی زۆر کەمە ، چونکە پێکهاتووی سەرەکی بریتیە لە توخمە سوکەکان وەك هایدرۆجین و هیلیۆم وەك لە وێنەی پێکهاتووەکانی‌دا دیارە ، هایدرۆجینە مێتاڵە شلەکەی ناخی مشتەری بەچاوگی سەرەکی کایەی موگناتیسی دادەنرێت .

گەرمایی ناخی مشتەری دەدرێتەوە بەشێوەی تیشکدان ، ئەم تیشکدانەش بەهۆی لێك‌هەڵوەشانی ناوکی‌یەوەیە یاخود لە ئەنجامی گۆڕانی دۆخ وە یان گەرمایی کۆکراوەیی ناخی مشتەرییەوەبێت .

دیمەنی مشتەری تەنها شریتە ئەتمۆسفیریەکەی نیشان دەدات ڕووکاری ڕاستەقینەی پلانێتەکە دەرناکەوێت .

مشتەری زۆر هێواشە ، وەبازنە شیریتیە گازەکانیشی لەخێرایی و گۆشەبەرزی جیاوازدان .

ئەم شریتانەیش روناك و تاریکن پێیان دەوترێت پشتێنە Belts یەك بەدوای یەك لەسپی‌یەوە بۆ زەرد ئنجا سێبەری قاوەی دەگۆڕێت پشتێنە رووناکەکانی بریتین لە هەورێکی کریستاڵی ئامۆنیا لە گازی هایدرۆجیندا .

ئەو پارچە سورە گەورەیەی سەر مشتری تیرەکەی گەورەترە لەتیرەی گۆی‌زەوی .

لە سەر مشتەری گەردەلوولێك هەڵیکردوە بۆ ماوەی 300 ساڵ ئەو خاڵە زۆر بچوکەی سەر مشتەری کە ماوەی دوو ساڵە دەرکەوتوە بەڵگەیە بۆ ئەو ڕایەی کە پارچە سورە گەورەکەی

مشتەری بە گەردەلولێكی گەورەو بەردەوام بێكۆتایی دادەنێت .

فویجەری یەك و دوو تێپەڕین نزیك مشتەری ، پێنج مانگی گەورە دەركەوتن بەو شێوەیە ژمارەی مانگەكانی بوون بە «15» .

وە وێنەی ڕوونی ئەم مانگانە نێرران بۆ زەوی ، مانگەكانیش ئەمانەن :ـ ئەلماثیا . Almathea ، ئایۆ . IO ، ئەوروپا . Europe ، گانیمیدا Ganymed كالیستۆ . Callisto .

ئەم مانگانە ئەسترۆنۆمیەكان ناویان ناوە مانگەكانی گالیلۆ چونكە گالیلۆ دۆزیونیەتەوە . ئایۆ چالاكی فۆلكانی سولفەری هەیەو ، وەك زەوی چالاكی فۆلكانی هاوچەرخیان هەیە .

وە ڕووی ئەوروپا بە هێڵی تاریكی شێوە تۆڕی داپۆشراوە ، 20 — 30 كیلۆمەتر فراوانن و درێژبونەتەوە بۆ (1000) كیلۆمەتر زیاتر .

گانیمید دیاردەی ئالۆزی بەشێوەی ڕیزی تەریبی و كۆڕی تیادایە (50 — 200) كیلۆمەتر فراوانن ، شەپۆلین ، دۆڵێ چەند كیلۆمەتر فراوانیان تیایە بەلام قوڵیان كەمە .

كالیستۆ ڕووەكەی كرن كونە گەورەترین كونی تیرەكەی ئەگاتە 848 كیلۆمەتر مشتەری بە بازنەی تەنك ئەستوری دەگاتە (30) كیلۆمەتر
دەوروەدراوە پێكهاتووی و
بنەچەی ئەم بازنانە تاكو
ئێستا نازانرێت ،
دروست بوون .
لە ماتەری قەبارە حەلان (Boulder)

**زوحەل :ـ**

زوحەل پانزە مانگی هەیە ، قەبارەی لە مشتەری بچوكترە ، شریتی ئەتمۆسفیری ڕەنگاوڕەنگی هەیە . دیارترین دیاردەی بریتیە لە سیستەمە بازنەیی یەكەی ، دەوری وەك لە وێنەكەدا دیارە . زاناكان بۆچوونیان وایە كە ئەم بازنانە لە دەنكۆڵەی شیوە بەفرین دروستبوون ، تیرەكانیان 4 — 30سم دەبێت .

یەكێك لە بۆ چوونە پەسەندەكان ئەوەیە كە ئەم بازنە تەنكانە لە دەنكۆڵەی وا دروستبوون كە نزیكن بە هێزی



وێنەی، زوحەل وبازنەكانی فویجەری یەك لە 1980/11/6 گرتویەتی .

كیش كردنی بۆ پێكهێنانی مانگەكانی . وەڕوونكردنەوە یەكی دی ئەوەیە كە لە پاشماوەی پارچەبوونی ئەو مانگە پێكهاتوون كە نزیك بوتەوە لە كایەی كێش كردنی زوحەل .

زوحـ ـ یدرۆجین و هیلیۆم و كرۆكێكی گەرمی شل بچوك پێكهاتووە ، لەبەرئەوە چڕی زوحەل زۆر كەمە ئەگاتە چڕی تەختە كەووت Maple Wood كە لەناو بۆریەك ئاودا سەردەكەوێت .

گەورەترین مانگی «تیتانە» كە ئەتمۆسفیری هایدرۆجینی هەیەو تەنها مانگە كە ئەتمۆسفیری هەبێت .

**ئۆرانۆس ، نپتۆن و بلۆتۆ :ـ**

ئەم پلانێتانە لەبەر دووری و كەمی تیشكی دانەویان و سەردانیان نەكراون لەلایەن كەشتی ئاسمانیەوە لەبەرئەوە زانیاریمان لەبارەیانەوە كەمە . ساڵێكی ئۆرانۆس 84 ساڵی سەر زەوییە ، لەم دواییەدا گۆڕانێكی گەورە لە ئەتمۆسفیری ئۆرانۆس دا دۆزراوەتەوە ، كە سیستمێكی بازنەیی هەیە وەك زوحەل و مشتەری بەلام ماتەری بازنەكان Rings نەزانراون .

نپتۆن ئەتمۆسفیری قوڵی هەیە شەوق دانەوەی بلۆتۆو جیاوازی لە نپتون بەهۆی سروشتی سوڕانەوەكەیەتی .

ئۆرانۆس و نپتۆن دوو پلانێتی گەورەو مانگداران ، بلۆتۆ لە گۆی زەوی بچوكترە تازە مانگێكی دۆزراوەتەوە ، میثانی بەستوو لەسەر ڕووی بلۆتو دەركەوتووە ، بەلام میثان لە ئەتمۆسفیری ئۆرانۆس و نپتۆن دا هەیە . ئۆرانۆس و نپتۆن كرۆكیان بەردینییەو دەورەدراون بەسەهۆڵ و گازی هایدرۆجینی . بلۆتۆ بەهۆی خولگە هێلكەییەكەیەوە تاكو ساڵی 1999 ڕێڕەوی سوڕانەوەی لە خۆرەوە نزیكتردەبێت لەچاو نپتۆن دا .

**قۆناغە سەرەتاییە گرنگەكانی گۆی زەوی :ـ**

گۆی زەوی لەئەنجامی کۆبوونەوەی دەنکۆڵەی زۆر بچوك دروستبووە ، کۆبوونەوەیەکی یەك بەدوای یەك ، جووڵەووزەیان گۆڕاوە بۆ گەرمی ، بەم شێوەیە سەرەتا پلەی گەرمی بەرزبۆتەوە ، دوایش چوونەوەیەك بەهۆی هێزی کێشکردنەوە پلەی گەرمایی بەرزبۆتەوە . سەرچاوەیەکی دی گەرما لێکهەڵوەشانی ناوکی توخمەتیشکدەرەکانە ، کە بڕی ئەم توخمانە لەسەرەتادا بلیۆنەها جاری ئێستابووە . دوای بلیۆنێك ساڵ هەور دروستبوو ، گەرمایی ناخی پلانێتەکان گەیشتە خاڵی تواندنەوەی ئاسن ، کە 1/3 ی گۆیزەوی پێکدێنێت . ئاسنەکە بەشێوەیەکی فراوان ، تواوەتەوە بەشێوەی تەنێکی فڕ ڕووەو چەقی گۆیزەوی ڕۆیشتووەو جێگای توخمی سووکی وەك سلیکۆن و ئەلەمنیۆمی گرتۆتەوە . ئەم تواندنەوە نوقم بوونەی ئاسن ووزەیەکی بەرزی پێکهێناو گۆیزەوی گەرم کرد بۆ 2000°س . بەو شێوەیە توخمەکانی تریش ڕەویان کرد بۆ پێکهێنانی مانتڵ و توێژ ئاسنیش کرۆکی پێکهێنا .

ئەو توخمانەی پلەی تواندنەوەیان نزمە وەك فلسبار ڕوویان کردۆتە سەرەوە بۆ پێکهێنانی توێژ ، کانزا ئاسنین و مەگنیسیۆمەکانیش چینەکانی خوارەوەی توێژیان دروستکرد .

جیابوونەوەی کانزاکان بۆ توێژو مانتڵ و کرۆك نزیکەی چوار بلیۆن ساڵ لەمەوبەر ڕوویان داوە کۆنترین بەرد تەمەنی

| | عەتارد | زوهرە | زەوی | مەریخ | مشتەری | زوحەل | ئۆرانۆس | نبتون | بلوتو | خۆر | مانگ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| تێکڕای دووریان لەخۆرەوە بە ملیۆن کیلۆمەتر | ٥٧,٨ | ١٠٨,٢ | ١٤٩,٦ | ٢٢٧,٩ | ٧٧٨,٣ | ١٤٢٧ | ٢٨٧٠ | ٤٤٩٧ | ٥٩٠٠ | نزیکەی ١٥٠ ملیۆن | نزیکەی ٣٨٤,١٧١ کم |
| درێژی ساڵانە (بەکاتی زەوی) | ٨٨ ڕۆژ | ٢٢٤,٧ ڕۆژ | ٣٦٥,٢ ڕۆژ | ٦٨٧ ڕۆژ | ١١,٨٦ ساڵ | ٢٩,٤٦ ساڵ | ٨٤ ساڵ | ١٦٤,٨ ساڵ | ٢٤٨ ساڵ | — | ٣٦٥,٢ ڕۆژ |
| تیرەی کەمەرەیان ئیستوائی بە کیلۆمەتر | ٤,٨٤٧ | ١٢,١١٨ | ١٢,٧٥٦ | ٦,٧٦١ | ١٤٢,١٨٧ | ١١٩,٣٩٩ | ٥١,٧٩ | ٤٩,٤٩٤ | ١٢٨٠ | ١٣٩٠٠٠٠ | ٣,٤٦٠ |
| درێژی شەووڕۆژ (بەکاتی زەوی) | ٥٩ ڕۆژ | -٢٤٣ ڕۆژ | ٢٣,٩ کاژێر | ٢٤,٦ کاژێر | ٩,٩ کاژێر | ١٠,٤ کاژێر | -١٠,٨ کاژێر | ١٦ کاژێر | ٦,٤ ڕۆژ | ٢٧ ڕۆژ | ٢٧,٣ ڕۆژ |
| بارستایی (زەوی = ١) | ٠,٠٥٥ | ٠,٨١٥ | ١ | ٠,١٠٨ | ٣١٧,٩ | ٩٥,٢ | ١٤,٦ | ١٧,٢ | ٠,٠٠١٦ | ٣٣٢٨٣٠ | ٠,٠١٢ |
| تێکڕای چڕی (ئاو = ١) | ٥,٤ | ٥,٢ | ٥,٥ | ٣,٩ | ١,٣ | ٠,٧ | ١,٦ | ١,٦٥٥ | ١,٠٤٨ | ١,٤٢٤ | ٣,٣٦ |
| بەرزترین پلەی گەرمی سەر ڕووی پلانێتەکە (°س) | ٣١٥ | ٣١٥ | ٦٠ | ٢٤ | -١٤٥ | -١٦٨ | -١٨٣ | -١٩٥ | -٢١٧ | ٥٥٤٠ | ١٠٠ |
| هێزی کێش کردن (زەوی = ١) | ٠,٣٧ | ٠,٨١ | ١ | ٠,٣٨ | ٢,٦٤ | ١,١٥ | ١,١٥ | ١,١٢ | ٠,٠٤ | ٢٧,٩ | ٠,١٧ |
| کێشی مرۆڤێکی "٧٠" کیلۆگرامی | ٢٥,٩ | ٦١,٦ | ٧٠ | ٢٦,٦ | ١٨٤,٨ | ٨٠,٥ | ٨٠,٥ | ٧٨,٤ | ٢,٨ | ١٩٥٣ | ١١,٩ |
| ژمارەی مانگەکانی | — | — | ١ | ٢ | ١٥ | ١٢ | ٥ | ٢ | ١ | — | — |
| کاتی نێردراو لە زەوییەوە بۆ پلانێتەکە | ١٤٦ ڕۆژ مارینەر ١٠ | ٩٤ ڕۆژ مارینەر ٢ | — | ٣٠٤ ڕۆژ ڤیکینگ ١ | ٦٠٧ ڕۆژ پایۆنیر ١١ | ٤ ساڵ پایۆنیر ١١ | ٩ ساڵ | ١٢ ساڵ | زیاد لە ١٢ ساڵ | — | ٣ ڕۆژ ئەپۆلۆ |

۳٤ بلیۆن ساڵە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمە هەرە دێرینەکانی تەمەنی گۆی زەوی لە گەشتێکی ...ورگران و ناخۆشدا بووە ...ووی زەوی وەك مانگ بەهۆی کەوتنە خوارەوەی ئەیزەکەوە کون کون بووە ، بەلام پاشماوەی ئەم کونانە بەهۆی کرداری کەشاندن و داماڵین و داخوادن و چالاکی ڤۆلکانی یەوە نەماون هەندێ شوێنی چاڵی ئەو ئەیزەکانە وەك (جێگەی ئەیزەکی ئەریزونا Arizona Meteoritc) کە 3000 ساڵ لەمەوبەر روویدا لە باکوری ئەمریکا .

**فەرهەنگۆك :-**

- «بازاڵت» Basalt :- بریتی یە لەبەردیکی رەشی تفتی ڤۆلکانی ئاگرین ، کانزای دەنکۆلەوورد پێکهاتووی سەرەکی کالیسیۆم پلاجیوکلیس و پایرۆکسینە ، هەندێ جاریش کانزای ئۆلینفینی تیادایە . بازاڵت دیاری دەکرێت بە بوونی بڕێکی زۆر کەم لە کوارتز .
- گابرۆ «Gabbro» بەردێکی تفتی ئاگرینە لەناوچەرگەیان ژێرزەویدا رەق دەبێت ، کانزای دەنکۆلەگەردە ، پێکهاتووی سەرەکی پلاجیوکلیس (لابرادۆرایت بۆ ئەنۆرسایت و پایرۆکسینە (ئۆجایت) . گابرۆهاوتای بەردی بازاڵتی ڤۆلکانیە .
- نۆرایت :- بەردێکەلە کۆمەڵەی گابرۆ بەلام کانزای تۆلیفنینی نیەو کانزای پایروکسینی مەعینی و لابرادۆرایتی تیادایە .
- ئەنۆرثۆسایت :- بەردێکی ئاگرینی ژێرزەوییە واتەکانزاکانی ئەم بەردە لەناخی زەویدا دەبن بەکریستاڵ و رەق دەبن ، 90٪ ی کانزای ئەنۆرسایتە (Anorthite) واتە کالسیۆم بلاجیوکلیس .
- ئەیزەك :- «Metoritc» بریتی یە لەو ماتەرانەی دەکەونە سەر زەوی ، هەندێکیان بەشێوەی تۆزوخۆڵ دەگەنەزەوی وەهەندێکی دی یان قەبارەیان یەجگار گەورەیە . پێکهاتووی سەرەکیان مێتاڵی نیکل ، ئاسن ، سلیکایە لەگەڵ هەندێ کانزای ناسەرەکی دی .
- ماگما «Magma» :- شلەیەکی گەرمی بزێوە لەژێر



«دوینەی جێگەئەیزەکی ئەریزۆنا لەباکوری ئەمریکا»

پەستانێکی گەورەدایەلە توێژی زەوی و سەرەوەی مانتڵ ، هەر دەرفەتێکی بۆ رەخسا دێتە دەرەوەو بۆ سەر رووی زەوی لەگەڵ ساردبونە وەیدا بەردی ئاگرین بەهەموو جۆرەکانیەوە بەپێی قوڵایی شوێنی رەق بوونی دروست دەبێت . ئەمتەنە شلە (ماگما) هەموو توخمە سروشتی یەکانی تیادایە بەلام پێکهاتوی سەرەکی مادەی سلیکایە .

- ڤۆلکان (Volcan) بەمانا «برکان» ، بەهاتنەدەرەوەی مادەی ماگما بۆسەر رووی زەوی دروست دەبێت .
- لاڤا «Lava» :- بریتیەلەو مادەیەی کەدەردەچێتە دەرەوە کاتێك ڤۆلکان روو دەکات ، لەسەررووی زەوی پێی دەوترێت لاڤا ، ئەم مادەیە ئەسیدیە یان تفت دەبێت . لاڤای ئەسیدی رووبەرێکی کەم ئەگرێتەوە چونکە لینجیەتی زۆرە ، بەلام تفت بەپێچەوانەوە رووبەرێکی فراوان لەسەر رووی زەوی داگیر دەکات .
- لیسثۆسفیر :- بەمانابەرگی بەردینی ، بەشی سەرەوەی توێژ (سیاك Sial) و سەرەوەی بەشی خوارەوەی توێژ (سیما Sima) دەگرێتەوە . ئەم بەشە رەقی زیاترە لەو چینەی لەدوای خۆیەوە دێت کە ئەستینۆسفیرە .
- ئەستینۆسفیر :- بەشی خوارەوەی سیمای توێژی زەوی دەگرێتەوە ئەم چینە نەرمەو پلاستیکی یە وجیرە لەچاوچینی لیثۆسفیر .

**سەرچاوە کانی ئەم باسە :-**

1 — John Wiley & Sons. 1981, Principles of Physical Geology. Page 518 — 529.
2 — Allen, J.p, 1972 Apollo 15 (Scientific Journey to Hadley — Apennine :— American Scientist, V.60 no — 2, Page 165 — 174.
3 — R.E. Head, J — Will, Jones, 1977 (The geology of Mars).
4 — D.G.A. Whitten & Brooks (1972) (A Dictionary of Geology).




# سەرئێشە

# Headache

مظفر عبدالرحمن حبيب
کولێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەدین

بەدەگمەن هەڵدەکەوێ سەرئێشە لە دەرگایماڵێکی نەدابێت و نەبووبێتە میوانی ناوەختەیان . خۆهەر بۆ جوانی نیە ، ئەوانەی هەنیەیان بە پارچە پەرۆ دەبەستن ، چ لەبەر دەنگخۆشیش نیە کە بە ساڵداچووەکان بە سۆزو نازێکی باوکانە یا دایکانەوەو بە دەم ژانە سەرەوە گۆرانی و حەیرانی تراجیدیانە تێدەچریکێنن .

میلانی یە سەرەتایی یەکان «Primitive melanisian» ، کە لە دوورگەکانی پاسیفی باشووردا جێنشین بوو بوون ، تا ئەم دوایی یە کون کردنی کاسەی سەریان کردبوو بە نەریت «Trepan-ing custom» بۆ دەرکردنی گیانی شەیتان لەسەردا . میلانی یەکان ئەم ڕێگەیان بۆ چارەسەر کردنی شێتی و سەرئێشەی درێژ خایەن پەیڕەو دەکرد . ئەو کاسانەی کە لە وڵاتە ئەورووپی و ئەمریکی یەکاندا ، بەتایبەتی لە مەکسیك و پیرۆدا دۆزراونەتەوەو شوێنەواری کون کردنیان «Trepaning» پێوە ماوە ، بۆ چاخە برۆنزی یەکان وچاخی بەردینی تازە «Neolithic» دەگەڕێتەوە . جا ئەگەر ئێمە کاسە کون کراوەکان بکەینە ڕوانگە ، ئەوا مێژووی سەرئێشە بۆ دەهەزار ساڵ لەمەوبەر بەڵکە زیاتریش درێژ دەبێتەوە .

ڕەنگە واچووبێتە ئەقڵی زۆر مانەوە کە سەرئێشە . ئازارو ئێشی دەماخە لە کاتێکا دەماخ «Brain» خۆی بەهیچ جۆرێک نائێشێ و هەست بە ئازاری ناکەین . شایانی باسە دەماخ تەنها ناڕاستەوخۆ بە هۆی هەندێ نەخۆشی وەك ئاوتێزان «edema» و شێرپەنجەوە «cancer» پەستان دەخاتە سەر لوولەکانی خوێن و دەبێتە هۆی سەرئێشە .

سەرئێشە ، بەمانا ڕووکەشەکەی ئەو ئێش و ئازارەیە کە ناوچەی سەر دەگرێتەوەو بەکپی «constant» یاخود لەشێوەی لێدان «pulse»دا هەستی پێ دەکەین . بێگومان سەر ئێشە بابەتێکی پان و پۆرەو لەناو چوار چێوەی ئەم باسە بچووکەدا بەئاسانی جێگەی نابێتەوە ، بەڵام بەپێی تواناو لەڕێگەی هەندێ نموونەی زیندووەوە هەوڵ دەدەین ڕۆشنایی بخەینە سەر زۆربەی لایەنەکانی ئەم نەخۆشی یە تا خوێندەواری ئازیز لەنەخۆشی یەکی دزێوی ژیانی ڕۆژانە شارەزابێ و هەندێ زانیاری پێویستی دەربارە هەبێت .

پێش ئەوەی بچینە بنج و بناوانی ئەم نەخۆشی یە بابزانین ئێش چیەو بۆچی هەستی پێدەکەین ؟ ! ئێش کرداری بەرگری لەشە بۆ خۆپاراستن لەمەترسی . بەوێنە : کاتێ دەستمان بەر دەرزی یاخود تەنێکی گەرم دەکەوێت یەکسەر دەستمان بۆ دواوە دەکێشینەوەو بەرپەرچەکردار «with drawal refex» دروست دەبێت . هەندێ لە دەمارە هەستی یەکان «sen-sory nerve» تایبەتن بە گواستنەوەی ئێش «pain» . ئەمانیش دووجۆرن جۆرێکیان خێراو ئەوی تریان بە هێواشی ئێشە کە بە ناوەندە کۆئەندامی دەمار «central nervous system» دەگەیێنێت . وێڕای ئەوەش زیاد بوونی چالاکی و تەزووی دەمارە هەستی یەکانی تر وەك بەرکەوتە دەمار «Tectile nerve» و دەماری گەرمی و ساردی ، ئەمانیش دەگۆڕێ بۆ دەماری ئێش گوێزەرەوە . بەوێنە گەرمی یا ساردی لەڕادە بەدەر ئازارمان دەدات .

دەماخی مرۆڤ هەمیشە ناتوانێت بەووردی شوێنی ئێشەکە دەسنیشان بکات . ڕەنگە نەخۆشی لە شوێنێك بێ و ئازارەکەی لەشوێنێکی تر هەست پێبکەین . بەم جۆرە ئێشەش دەوترێت ئێشی گواستراوە «Refared pain» . هۆی ئەم تەمەڵی یەی دەماخیش یەککرتنی چەند هەستە دەمارێکە «convergance» پێش ئەوەی بۆ دەماخ بچن ، بەمە زانیاری یەکان تێکەڵ دەبن و دەماخ لێی تێك دەچێ و بەزۆری ئێشەکە بەهی شوێنێك دەزانێ کە پەیوەندی یەکی کۆرپەلەیی «Embryological» بەشوێنە

بنەڕەتی‌یەكەوە هەیە هەر بۆیە ئەوانەی نەخۆشی دڵیان هەیە ڕووی ناوەوەی قوڵی چەپیان دێشێ‌و ئەوانەی نـاو پەنچكیـان «Diaphra gum» ناتەواوە شـانیان ئـازاریان دەدات . بێ‌گـومان سەرئێشە یەكێكە لەم جۆرە ئێشانە . ڕەنگە خـۆشت تێ‌بینی ئـەوەت كردبێت ، لەكـاتی خواردنی ئـایس كرێمـدا هـەست بەتەزینی هەنیەمان دەكەین . ئەمەش لەئـەنجامی وروژانی لقێكی ئەو دەمارەیەكەبە دەم‌و چاوو نیوەی پێشەوەی سەردا بڵاوبۆتەوەو بە سێ‌جمكە دەمار «Triyeminal nerve» ناودەبرێت . ددان ئێشەو هەوكردنی پووی ددان ڕەنگە بۆ دووەم یا سێ‌یەم لقی سێ‌جمكە دەمار بگوێزرێتەوەو بێتە هۆی شەویلاگ ئێشان‌و هەندێ جاریش سەرئێشە . ئازاری گوێ‌و لاجانگ «temple»یش لەوانەیە ناڕاستەخۆ پەیوەندی بەكەم‌و كوڕی‌یەكانی ددانەوە هـەبێت . بەهـەمان دەستـوور هەر نـاتـەواوی‌یـەكی مـل‌و بـڕبڕەكـانی خۆی لەسـەر ئێشەی بـەشی پشتەوەی سـەردا دەنوێنێ . چوونكە هەمـوو ئەو ئێشـانەی لەبـەشی پشتەوەی سەروو ناوچەی سەرەوەی ملدان لە ڕێگەی دووەم دەمارەوە «Second cervical nerve» دەگـوازرێنەوە . هـەر لەجێ‌چـوونێكی بڕبڕەكانی مل بەهۆی خورانی كركراگە خـەپلەكانـەوە «Disk» پەستان دەخاتەسەر ڕەگ «Root»ی دەمارەكانی مل‌و ژان بـۆ پشتەوەی سەر دروست دەكات . بەتایبەتی لەكـاتی جوڵانی ملدا . ئاسایی‌یە ئەم ئێشانەی مل بۆچاوو هەنیە بچن ، بەهۆی هەندێ لەو دەمارانەی لە چاوەوە بۆ دركە پەتـك «Spinal cord» دێن‌و پەیوەندی لەگەڵ دەمارەكانی ملدادەكەن .

تێكچوونی ئەستوونی مل ، دەشێ پەستان بخاتە سـەر بـڕبڕە خـوێنبەر «Vertebral artery» ، ئـەو خوێنبـەرەی بـە نـاو بڕبڕەكانی ملدا بەرز دەبێتەوەو خوێن بۆ دەماخ دەبات . بەمە ئەو خوێنبەرە شێوەی زیگزاگ «خواروخێچ» وەردەگرێت‌و بڕی ئاسایی خوێنی پێدا ناڕوات‌و «Vertebro — bassilar insufficiency» . خوێنی پێویست ناگات بە دەماخ . ئەوسا سەرئێشەی یەكلایی مل «cervical miyraine» دوچاری نەخۆش دەبێت‌و هـەندێ كـەم كوڕی هۆشی لەگەڵدا دەبێت وەك : وون كردنی لەنگەرو زمان تێك ئاڵان‌و .. هتد .

گومانی تێدانیە كە زۆر جووڵانی مل‌و گرژبـوون ورەق بوونی بەردەوامی ماسولكەكانی پەیوەندی‌یەكی پتـەوی بە شلەژانە سەرئێشەوە «fension head ache» هەیە .

بۆیە پاراستنی لەنگەری مـل‌و كەم جـوولە پێ‌كردنی‌و حـەسانـەوەی یارمـەتی كەم كـردنەوەی ئـەم سەرئێشـەیە دەدات . هەروەها ڕێگەی نەشتەرگەری مل پەیڕەو دەكرێت بۆ ڕێك خستنەوەی بڕبڕە كانی مل نەهێشتنی فشار لەسەر دەمارو خوێنبەرەكانی مل‌و ئینجا بنەبڕ كردنی مله سـەر ئێشە «neck headache» .

● كشانی «disten tion» لوولەكانی خوێن :

لە هۆیە بنەڕەتی‌و باوەكـانی سەر ئێشـەیە ، كهـولیش بەوەی لەو مادانەیە كە دەبێتە مایەی كشانی لوولەكانی خوێن «Dilator of blood vessels» زۆر جار سەر دەخاتە ژان . ئەمەش بە هۆی كاری ڕاستەوخۆی پـارچە شكێنـراوەكانی هیستـامینە ئەسیتایت «Acetate»و ئەسیت ئەلدیهاید «Acetaldehyde» كە لە ناو خواردنەوە كهولی‌یەكاندا هەن‌و بەخوێندا دەسووڕێنەوە .

كەم بوونەوەی ئۆكسجین لە خوێندا دەبێتە هۆی كشانی لوولەكـانی خوێن تـاوەكو بـڕی پێویست لە «$O_2$» ئـۆكسجـین بەشانەكانی لەش بگەیێنێت . كەڵەكە بوونی دووەم ئۆكسیدی كاربۆنیش «$CO_2$» هـەمان كـاریگەری هـەیە . لەبـەر ئەمـەیە كۆبوونەوە لە ژووری تەسكی پەنجەرە داخـراوو قەڵەبـاڵغدا سەرمان دەخاتە ژان .

خواردنی گۆشتی خوێ‌كراو ، بەهۆی ئـەو نایتـراتەی تێكەڵ بەخوێ‌یەو ڕەنگی سووری گۆشتەكە دەپارێزێت ، ژانە سەر بۆ هەندێ كەس دروست دەكات . چوونكە نایتراتیش لەو مادانەیە كە دەبێتە هۆی كشانی لوولەكانی خوێن لەسەردا . هەروەك چۆن زیدە خواردن‌و خواردنەوە زۆر جار دەبێتە مایەی سـەرئێشە ، هـەروەهاش كـەم كردنـەوەی خۆراك هـەمـان كاریگەری هەیە . بێ گومان برسی‌یەكان‌و ئەوانەی ڕۆژو دەگرن زیاتر بـەم جۆرە سـەر ئێشەیـە ئاشنـان . هۆی ئـەم ڕۆژوە سەرئێشەیە «Fasting headache» كەم بوونەوەی ڕادەی شـەكرە لەخوێندا . شایانی باسە ئەوانەی نـەخۆشی شـەكر «Diabetes Mellitus» یـان هەیـەو ئەنسـولین «Insulin» بەكـاردێنن بۆ كـەم كردنەوەی ڕێژەی شەكر ، هەندێ تووشی سەرئێشەو بوورانەوە دەبن بـەهۆی زۆر خـواردنی ئـەنسـولین‌و دابـەزینی لەڕادە بەدەری ڕادەی شەكری خوێنیان .

● هـەموو ئـەو مادانـەی كە لوولەكـانی خوێن گـرژ دەكەنەوە «Vaso constriction» ژانە سەر كەم دەكەنەوە .

کافائین «Caffeine»و نیکۆتین «Nicotine»و ئێر گۆتامین «Ergotamine» لەم جۆرە مادانەن . ئەوانەی دوو چاری سەرئێشەی درێژ خایەن بوون گەر هاتوو بەبەردەوامی کافائینیان لە تابلێتی A.P.C «Aspirin ,phenacetin ,and. caffeine» دا بەکارهێنا ، ئەوا لولەکانی خوێنیان بە نیمچە گرژی دەمێنێتەوە . هەرکاتێ لەبەکارهێنانی وەستان ، لولەکان بۆ باری ئاسایی خۆیان دەکشێنەوە . بەمە دووبارە سەر دووچاری ژان دەبێتەوە «Rebound headache» . سەرەڕای ئەمە بەردەوام بەکار هێنانی حەبی هێمن کەرە «Analyesic tablet» لە دواڕۆژ زیان بە گورچیلەکان دەگەیەنێت . بەهەمان دەستوور ئەوانەی بەسەماوەر نەبێت چا ناخۆنەوە ، گەر ڕۆژێك یاخود جەمێك چا نەخۆنەوە لەبەر ژانە سەر ئارامیان لێ دەبڕێ و دەست بە بۆرە بۆر دەکەن .

● **سەرئێشەی دوای جووت بوونیش «Orgasm»**

جۆرێکی ترە لەو ژانە سەرە ئاساییانەی لەکاتی کرداری سێکسدا لەوانە دەستپەڕیش «Masturbation» تووشی مرۆڤ دێن . ئەم سەر ئێشەیەش «Benign Sex headache» دوو هۆی گرنگی هەیە : کرژبوون و ئەرکی ماسولکەیی «Muscular contraction»و ووروژانی سۆز «Emotional excite ment» ئەم دوو کردارەش کە ئەنجامێکی ئاسایی ئۆرگانم «Orgasm»ە ، لێدانی دل بۆ 110 — 190 لێدان/ چرکەو هەروەها پەستانی خوێنیش بە ڕێژەی 20 — 80٪ بەرزدەکاتەوە . ئەم گۆڕانە فەسلە جیانەش لە شێوەی سەر ئێشەدا خۆیان دەنوێنن و لەدوای تۆ هاوێشتنەوە «Ejaculation» دەست پێ دەکات و ڕەنگە چەند ساتێك یاخود چەند ڕۆژێك درێژە بکێشێت . بۆچارەسەری بەکارهێنانی دەنکی «Er-gotamine tartarate» پێش کرداری جووت بوون ئەم سەرئێشەیە ناهێلێ .

بەهۆی بەرز بوونەوەی پەستانی خوێن و کشانی خوێنبەرەکانی سەر دەشێ ماندووبوون و ڕەنج کێشانیش سەر ئێشەیان لەگەڵدا بێت .

هەندێ دەرمان هەیە کاری لاوەکی «Side effect» کار دەکەنە سەر کشانی لولەی خوێن و سەرئێشە . لەم دەرمانانە : نایترۆگلیسرین «Nitro — glycerin» کە بۆ نەخۆشی سنگە سووتێ «Angina pectoris» بەکار دەهێنرێت و ئیندومێثاسین «Indome thacin» کە بۆ جومگە ئێشە «arthritis»و ئازاری ماسولکەکان بەکاردەهێنرێت .

● **سووتانەوە «التهاب»ی هەر ئەندامێکی لەش ،**

کشانی خوێنبەرەکانی لەگەڵدا دەبێت وەك بەشێك لە پرۆسێسی هەوکردنەکە «Inflamatory process» بۆ ئەوەی لە جاران زیاتر خوێنی بۆ بچێت و تا ئەو خرۆکە سپی «white blood cell» یانەی بداتێ کە پێویستن بۆ بەرگری لەش «Body defeness» . سووتانەوەی ئەو پەردانەی دەوری دەماخیان داوە «meningitis» بەهۆی بەکتریاوە بەسەرئێشە دەست پێ دەکات لەگەڵ کارلێکردنی ڕووناکی «Photo phodia»و تاو ڕەقەبوونی مل . ئەم سووتانەوەیە لەوانەیە ناڕاستەوخۆ بەهۆی خوێنەوە بگوازرێتەوە ، وەیان ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی گوێ و لووت و کیسە خوێنەکانی ناو کاسەدا بگات بە پەردەکانی دەماخ و ڕەنگە لەوێشەوە دەماخ بتەنێ و تووشی سووتانەوەی «Encephalitis» بکات . هەروەها ڤایرۆسیش «virus» دەماخ تووشی سووتانەوە دەکات . بە سووتانەوەی دەماخ و پەردەکانی پێکەوە دەووترێت پەردە دەماخە سووتێ «meningo encephalitis» . بەوەرگرتنی چەند میللمەترێك لە درکە شلەی دەماخ «cerebrospinal fluid» ، ئەو شلەیەی دەوری دەماخی داوەو جێگیری کردووە ، لە ڕێگەی کون کردنی کەلەکەوە «Lumbar puncture» دەپشکنرێت . زۆری خانە لە ناو شلەکەدا پەنجە بۆ ئەم نەخۆشیانە رادەکێشێت .

● **پەستانی ناو کاسەی سەر**

«Intra cranial pressure»و پەستانی درکە شلەی دەماخ «Cerebrospinal fluid»و پەستانی ناو شانەکانی دەماخ ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە پەستانی خوێن بەرەکانی مێشکەوە هەیە بەرزبوونەوەی پەستانی خوێنیش دەبێتە هۆی سەر ئێشە . زۆر جار بەهۆی ئاو تێزانەوە «ceredral edema» مێشك دەئاو سێ و پەستانی ناو کاسەی سەر بەرز دەکاتەوە شایانی باسە زۆر بەکارهێنانی ڤیتامین — A — هۆی ڕاستەوخۆی ئاوسانی مێشکە لەوانەشە ئاوسانی مێشك بەهۆی ژەهراوی بوونی قورقوشمیەوە . بێت کەلەدوای چارەسەر کردن تتراسایکلین و نالیدیکسیك ئەسید «nalidixic acid»و ستیرۆیدەکان «Steroids» زۆر جار نیشانەکانی بەدەرکەوتووە . دەرزی مانیتۆل یاخود گلیسرۆل بەهۆی مژینی شلەی شانەکان سنوور بۆ ئاوسانی دەماخ دادەنێ و نایهێلێ .

بە نزم بوونەوەی پەستانی درکە شلەی دەماخ ، مێشك «Brain» دەکەوێتە جولەو بە بزاوتنی پەستان دەخاتە سەر لولەکانی خوێن «Blood vessels» بەتایبەتی لە کاتی دانیشتن وەستاندا دەبێتە هۆی سەرئێشە بەزۆریش ئەم سەر ئێشەیە

ـوای کەللەکە کون کردن «Lumba puncture» پەیدا دەبێت .

● جۆرە سەر ئێشەیەك ، بەتایبەتی تەنگ بەوانە هەڵدەچنێ کە لەسەرووی (55) سالیەوەن

ئەم سەرئێشەیە ئەنجامی سووتانەوەی «Inflamation» خوێن بەرەکانی پێستیسەرە «sculp»و بەسووتانەوەی خوێن بەرەکانی لاجانگ «Temporal arteritis» دەناسرێت . لەنیشانە دیارەکانی ئاوسانو سووربونەوەو دەرپەڕینی خوێن بەرەکانی لاجانگە . ئەگەر خێرا بەهۆی ستیرۆیدەکانە وە «steroids» چارە نەکرێت ڕەنگە خوێنبەرەکانی دەماخو ئەندامیتری لەش بتەنێتەوە خۆ ئەگەر سووتانە کە بگاتە خوێنبەری چاو «Ophthal-mic artery» ئەوا دەبێتە هۆی کوێری .

● لەگەڵ ئەوەی شێرپەنجەی دەماخ «Brain tumor»

نابێتە هۆی سەرئێشە تاخوێنبەرەکان نەخاتە لاوەو فشاریان نەخاتە سەر ، لە 90٪ ی دەماخە پەنماوەکان سەرئێشەیان لەگەڵدایە وەکو نیشانەیەکی دیارو لەگەڵ کۆکینو پژمیندا تەشەنە دەکات شێرپەنجەکە لەوانەیە ساکار بێتو «be-nign tumor» توانای چارەسەری هەبێت هەروەکو شێرپەنجەی ژێرکاژە رژێن «Pituitary gland» و شێرپەنجەی کاسە دەماری هەشتەم (کەدەبێتەهۆی کەڕی)و ئەو شێرپەنجەیەی کە لە پەردەکانی دەماخەوە دەتەنێتەوە «meningiomas» .

لەوانەشە شێرپەنجە کە پیسو کوشندە بێت «malignant tumor»و نەتوانرێت لا ببرێت هەروەکو ئەو شێرپەنجەیەی «Cancer» دووچاری گلیا «glia» واتە بەستەرە شانەی «connective tissue» دەماخ ، دەبێتو بە گیلومەس «gliomus» دەناسرێتو 45٪ی هەموو کانسەرەکانی دەماخ پێکدەهێنێت . شایانی وتنە 8٪ی کانسەرەکانی دەماخ لە شوێنیتری لەشدا بۆی دێت وەك سیەکان (کە بەرپرسیاری 65٪ یانە) ، مەمكو جوگەی هەرسو گورچیلەکان . زۆربەی جار کانسەری دەماخ هەندێك کەمو کوڕی ژیری «mental illness» لەگەڵدا دەبێتو لەوانەیە هەندێکیان ئاشکرا بەنەخۆشەکەوە دیار بن وەکو بێهێزیو لاوازی لایەکی لەشو تێکچوونیو لەنگەرو شێوانی بینینو کەڕیو وون کردنی هەستی بۆن کردنو زمان تێك ئالان . پشکنینی نەخۆش لەلایەن پزیشکی پسپۆڕی دەمارەوە «neurologist» بۆ دەست نیشان کردنی جۆری شێرپەنجەکە بەهۆی نەخشەکێشانی دەماخ «EEG»و تیشکی « × »و ڕێگەی دیکەوە پێویستە بۆ لابردنی کانسەرەکە ئەگەر لە جۆری ساکار «Benign» بێت .

● ئەگەرچی زانستی تازە هێشتا هۆو چارەسەری شلەژانە سەرئێشە «Tension headache»ی نە دۆزیوەتەوە ، بەلام هەرچۆنێك بێت دوو مانای بۆ دارێژراوە :

یەکەمیان ئەو شلەژانە ناوخۆییەی سۆز «Emotion»و ژیری «Mental»یە کە بۆ ئەو هەڵوێستانەی ژیانی کەسایەتی دەگەڕێتەوە کە چارەیان نیە . دووەمیان ئەو شلەژانە فیزیائی «سروشتی» یەیە کە زۆر جار ناهێڵێ مرۆڤ بحەسێتەوە لەگەڵ نەبوونی هیچ تەنگو چەڵەمەیەکی عاتیفی «Emotional problem»دا .

خەڵکی لەروو بە روو بوونەوەی هەڵچوونو داچوونو خەمو کۆستو تراجیدییە کەسایەتیەکاندا دەکرێن بە دوو پۆلەوە . هەیانە خۆیان دەدەنە دەست واقیعەکەو تەنانەت بە دەم شەپۆلی لاوازی کۆستێکەوە تل دەخۆن ، هەشیانە لە هەمان هەلوێستدا هەلچوونە عاتیفیەکانیان کپ دەکەنەوەو خەمو پەژارەکانیان دەرنابڕن تابەسەریاندا زاڵ دەبنو بنەبڕیان دەکەن . بێگومان هەر فشارێکی ئەقلی «mental» فشارێکی فیزیائی دەخاتە سەرلەشو تێك گرێدانی ئەم دووەش بە شلەژانی دەماری «Nervous tension» دەناسرێتو شلەژانە سەر ئێشەش جۆرێکیانە .

شلەژانە سەرئێشە لە 90٪ی نەخۆشەکاندا هەردوو لای سەر دەگرێتەوە لە کاتێکا سەرئێشەی یەك لایی «migraine» تەنها یەك لای سەر دەگرێتەوە . شلەژانە سەر ئێشە بەئاسانی دەناسرێتەوە چونکە زێدەتر بریتییە لە گژربوونو پەستانێکی بەردەوام وەك لەئێشو ئازار . ئێشێکی کپی «Dullache» هەنیە ، لاجانگ یاخود پشتەوەی سەرە . لەوانەشە هەموو سەر بگرێتەوە . مرۆڤ واهەست دەکات سەر ی بەستراوەتەوە یاخود قورساییەکی گرانی خراوەتە سەر . نەخۆش ڕووگرژو تووڕە دیارە . تەشەنە کردنی ئێشەکەو ژانە لێدانی بەڵگەیە بۆ کشانی لولەکانی خوێنو بە شلەژانەسەر ئێشە لولەیی «Ten-sion vascular headache» ناو دەبرێت . ئەوانەی تووشی سەرئێشەی درێژخایەن بوون نەك تەنها لە باری نائاسایی سەریان ژان دەکات بەڵکو لەگەڵ هەر گۆڕینێکی کەشی دەرونیشدا وەك سەردانی هاوڕێیان چوونە شارو بازاڕ کردن تەنگیان بێ هەڵدەچنێ . دەرکەوتووە لەکاتی شلەژانە سەرئێشە لولەکانی خوێن لەسەردا کرژدە بنەوە کەواتە ئێشەکە لە ئەنجامی کشانی لولەکانی خوێندا نییە . زێدە کرژبوونی ماسولکەکانی سەرو شەویلاگو مل پەیوەندییەکی ڕاستەو

خۆی بەم سەرئێشەوە هەیە ئەمەش دکتۆرەکانی گەیاندە هۆی ئەم سەرئێشەیە ... نەبوونی ئۆکسجینی پێویست لە ئەنجامی تەسکی خوێنبەرەکانی سەر لەلایەك و زیدە چالاکی ماسوولکەکانی لەلایەکی تر دەبنە هۆی گرد بوونەوەی ئەو ماددانەی دەبنە مایەی ئێشان لەناو ماسوولکەکاندا ئنجاش سەر ئێشە . هەر بۆیەشە خواردنەوەی مەی (کحول)و ئەو مادد انەی لوولەکانی خوێن فراوان دەکەن کارێکی باش لەسەر کەم کردنەوەو نەهێشتنی ئەم سەرئێشەیەدا دەگێرن . خوێنبەرە کرژەکانی نەخۆش بە درێژایی ڕۆژ ، لەکاتی حەسانەوەی شەودا فراوان دەبن بۆیە دەشێ بەشلەژانە سەرئێشەیی لوولەیی ڕۆژ بکاتەوە . ئەوانەی بەردەوام ڕوویان گرژە (واتە ماسوولکەکانی هەنیەیان لەکاردایە) ناوچەوانیان دیشێ و ئەوانەی بۆ ماوەیەکی زۆر قسە دەکەن بەهۆی جوولانی ماسوولکەکانی شەویلاگ لاجانگیان «Temple» ژان دەکات .

کەم وکوڕی چاو هۆیەکی تری شلەژانە سەرئێشەیە ئەمەش بەهۆی ئەو ڕەنجەی ماسوولکەکانی چاو دەیکێشن بۆ پاراستی لەنگەری بینین . گیروگرفتەکانی ژیان لەبن نایەن و لە تێکچوونە دەروونییەکاندا ڕەنگ دەدەنەوە . تەنگ و چەڵەمەی ئابووری و رامیاری و کۆمەڵایەتی (سێکس و تەلاقدان و خۆشەویستی .. هتد) ، دڵتەنگی و دڵە ڕاوکێ و تووڕەیی بۆ مرۆڤ دروست دەکەن ، ئەمانەش دەربڕینێکی فسیۆدەروونی «Psychophysiological» ئەو سەرئێشانەیە کە هۆکەی کرژبوونی ماسوولکەکانی سەرە . حەسانەوەی دەروونی و خاوکردنەوەی ماسوولکەکانی مل و دەم و چاو و چارەسازی دەروونی ڕێگەی چاکی بنەبڕکردنی شلەژانە سەرئێشەن .

● ئەوەی تا ئێستا لێی دواین ئەو سەرئێشەبوو کە هەموو سەر یا نیوەی پێشەوەی یاخود هی دواوە دەگرێتەوە بەلام سەرئێشەی یەك لایی «migraine» سەرئێشەیەکی خولییەو بەردەوام دووپات دەبێتەوەو ئاسوودەیی مرۆڤ دەشێوێنێ و بەپێچەوانەی جۆرەکانی تر تەنها یەك لای سەر دەگرێتەوەو هۆیەکەی کشانی لوولە خوێنەکانەو کرژبوونی ئەو موولوولە خوێنبەرانەیە کە خوێن بۆ دەماخ دەبەن . لە ئەنجامدا خوێنی پێویست بۆ دەماخ ناچێت و سەر ئێشەکە هەندێ نیشانەی کەمەوکوڕی دەماخی لەگەڵدا دەبێت وەك لاواز بوونی تەواوی یەك لای لەش «one — sided weakness»و شێوانی بینین و زمان تێك ئاڵان و ... هتد . بۆ جیاکردنەوەی ئەم نیشانانە لەهی سەرئێشەی شێرپەنجەی دەماخ ئەوەندە بڵێین بەسە کە سەرئێشەی یەکلایی «migraine» تەنها یەکلای سەر دەگرێتەوە . ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەم سەر ئێشەیە ڕشانەوەو لەهۆش خۆ چوونی لەگەڵدا دەبێت وەك دوونیشانەی دیار . گۆڕانی ڕادەی هۆرمۆنەکانی خوێن پەیوەندی بەم سەرئێشەوە هەیە . بە وێنە بەزۆری لەکاتی سووڕی دەست نوێژی مانگانە «Mensturation» دا ئافرەت دووچاری سەر ئێشە دەبێت . لەبەر کەمبوونەوەی ئاستی هۆرمۆنی ئیسترۆجین «Estrogen hormon»و هۆرمۆنی پرۆجیسترۆن «Progestron hormon» . ئەم نزم بوونەوەش دەبێتە هۆی ڕژاندنی پرۆستا گلاندین «Prostaylandin» کە بەرپرسیارە لە کرژبوونەوەی موولوولە خوێنەکانی سەرو دەماخ و دوایش سەرئێشەی یەك لایی . برینداربوون و لێدانێکی کوشندەی کاسەی سەرو گۆڕانی ئاووهەواو بەرزونزمی پەستانی هەواو جەنجاڵی و فشارە سۆزییەکان «Emotional stress»و نەووستن و زۆر خواردن هەروەهاش کەم خۆراکی و مەی و وەرزش کردن و ئەرك کێشان هۆی تری ئەم سەرئێشەیەن . ڕێگە کلاسیکییەکەی چارەکردنی سەر ئێشە دانانی شتی ساردو گەرمە لەسەر هەنیەو لاجانگ و تەوقی سەر . بێگومان زانستی پزیشکی نکوڵی لە سوودی ئەم ڕێگە تەقلیدییە ناکات چوونکە ساردی دەبێتە هۆی کرژبوونی خوێنبەرە گەورەکانی لاجانگ و گەرمایی خوێنبەرە بچووکەکانی پێستی سەر «scalp» فراوان دەکات . بەمە سەر ئێشە کە سووك دەبێت . دەرزی ئاژەن کردن «Acupuncture» ڕێگەیەکی ترە بۆکەم کردنەوەی ژانە سەر پەیڕەو دەکرێت . هەروەها دژە هستیامین «Anti — Histamin» و «cafergot» و «Ergotamine tartarata» و «miyral» ڕۆڵێکی باش دەگێڕن لە چارەسەری کردنی ژانەسەری یەك لایی «migraine»دا .

## سەرچاوەکانی ئەم باسە :-

1 — James. w. Lance. tleadache, unders tanding alle viation. 1975.

2 — Text book of medical physiology Gyuton.

3 — Ekbom, karl, clinical aspects of cluster headache (vol. 13. 1974)

٤ - مرۆڤ و دروستی . پۆڵی سێهەمی ناوەندی .
«بۆزاراوە زانستییەکان سوودی لێوەرگیراوە»




عومەری عەلی ئەمین

# نموونەی سەرگوزەشتەگێڕانەوە لە فۆلكلۆری كوردیدا

ئەوا هەڕەتی گەنجیمە، تازە خەتم داوە، دەور دەوری ڕەش بگیری عوسمانلیە، منیش وەك و ڕۆڵەی ئەم خەلكە گیراوم بە ئەسكەر ڕەوانەی شەر كراوم. ئەوەتام لەكوێ ؟ لەو دەورو بەری قوڵی قاوقازە. وەخت كەیە ؟ هەموو وەختێ وەختی خوایە ساڵ ئەم وەختانەیە. لە چادرەكەما كێم لە گەڵە ؟ یادی بەخێربێت مامەوڕەحمانی گەڕەكی خۆمان. جا ئەم هەتیوەی كوڕی كە ئێستا وا هەڵئاوساوەو خەلكی ووردو درشت نەحلەتی لێ ئەكات نازانێ خەلكی قافەزی سپی ئەخوێننەوەو لەو وایە كەس نازانی كە خەفیەی نوری سەعیدە، ئەم هەتیوەی؛ ئەوسا منال بوو تازە گاگۆلكێی ئەكرد، بیری نایە كە چۆن باوكی گیرا بە ئەسكەر. بەخوا ئەو بەستەزمانە لە خەلوزدانی ناو گەنجینەكەی خۆیانا كێشیان كردە دەرەوە. جا چۆن پیاوێك بوو حەدی نەبێ لە رووی خۆتانا، پیاوێكی پیاوانە. جا ئەوەتا مامەوڕەحمان نۆغر ئەكات و خوێری وای لەپاش بەجێ ئەمێنێت. بەخوا بەزەهری مارەوە ئەخورا.

ئێ جگەلە ئەو عەبە سوور قاوشانی و شەریفی خونچە كەڕو، لە دەنگم دانەچلەكێ فۆ حلای خۆمانم لە گەڵە... نەء، شەیتان بەنەحلەتبی عەبەو شەریف ئەم شەویان لە هەموو شەوێ خۆشتر بێت ئەوان لەوێ لەگەڵم نەبوون. ئەوان ئەوسا نەمابوون، ساڵێك لەوەپێش عەبە لە شەڕی چەناقەلعەدا شەهید كرابوو، شەریفیش تیا بە یەخسیر گیراو ئەو بردنەی برا، ئیتر نەهاتەوە.

باشە ئالاقومانداری كێیە ؟ غەریقی ڕەحمەتی خوابێت، خەسرەو بەگ ئالاقوماندارییە. یوزباشیشمان بلێین كێ بوو ؟ عەبدول حەمیدە فەنیەك هەبوو لەم گەڕەكەی خوارەوە، ئەو یوزباشی بوو، جا ئەم لە شەڕەكەی عەرزوڕوما ڕوحی بە جەننەت شاد بوو.

جا ئەڵێ قسە، قسە ئەبرێت، با بەسەریا تێنەپەڕین ناوی شەڕی چەناقەلعەم برد، كاكە عەمرێك هات ووتیان ئەبێ ئۆردو فێری شەرقی بین. كام شەرقی ؟ شەرقی چەناقەلعە. بەڵێ باشە. دەی برام ئەمە هەتا ماوەی دوو حەفتە هەموو ڕۆژێك ڕۆژی یەك دوو سعاتێك، ئەمە ئێمەیان دائەناو شەرقیان فێر ئەكردین.. سوێندتان لەسەرم نییە ئەو ئۆنباشییەی كە ئێمەی فێر ئەكرد كابرایەكی توركی ئەستەمول بوو، ئەو قورمساغە یەك دەنگی پێوەبوو قورعان بە حەقت مەلی بە عاسمانەوە ڕائەگرت ! ئەو مردومراوە كە لەگەڵ ئەم باندوكەڕەنایەدا تێی ئەچریكان و ئەم ئۆردوەش بەجارێك لەگەڵیا ئەووت، پیاو هەرچی دەمارەكانی لەشی هەبوو ئەكەوتە هەلەكەسەما (بەیادی جارانیەوە چاو پڕلە فرمێسك، بە دەنگە گڕە پیرەكەیەوە یەك دوو دێری گۆرانییەكە دەلێت).

**(چەنا قەلعە ئیچندە ووردولەر بەنی**
**ئۆیلمەدەن مەزارە قۆیدولەز بەنی)**

ئا...ی بۆ ئەو سەردەمی گەنجێتیەت غەفور !! ڕۆیشت ! تازە ڕۆیشت ئەو گەنجێتیە نابینیتەوە ! جا ئەڵێ زۆر وتن قورعان خۆشە با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان.

برا باشەکەم ! ئەوا وەك شەوی ئەم شەو، شەوێکی تۆفی زستانە، بەفر یەك ناوقەد لە عەرزایە، لە نزیك دێیەکەوە ئۆردوو بارەگای هەڵداوە، چاك لە بیرمە ئەو شەوە لە چادرەکەما خەوم لێزڕا. جا تۆ سەیری نەوسی بەشەریش کە، تومەز ئەمە نەفسم چوّتە سەر حەڵوای ئاردی گەنم، ئیتر نازانم برسیم بوو چی ؟ خۆ هەرچەندە بەسکێك تێر بووین و بە دە سکیش برسی، ئیتر وەخت بوو زروکە بۆ حەڵوایە بکەم. لە دڵی خۆشما وتم: بۆچی غەفور ئەمە گوێ ئاگردانەکەی ماڵی خۆمانە دایکم دەست وبرد تاوەیەك حەڵوام بۆ قوت کاتەوە ؟

سەرتان نەیەشێنم کە ئەم نیازی دڵەم لای مامەوڕەحمان و فۆحلا درکاند؛ هەردووکیان دامیانە بەر لێشاوی گاڵتەو پێکەنین. وتم ئەرێ ئێوە ئەو گاڵتە پێ کرد نەتان لە چی یە ؟ سا بەخوا ئەگەر سەریشم داناوە من ئەم شەو خۆم لەم ئۆردوگایە ئەدزمەوەو ئەچم لە ماڵێکی ئەو دێیە حەڵوایەك ئەخۆم. ئیتر دووای مشت ومڕێکی زۆر لە گەڵ ئەوڕەحمان و فۆحلا کە ئەمە کاری کردە نی یەو، نەوس ئەوە نایەنێو، خۆت ئەدەی بە قەڵبەیەکاو، کە زانیان من لەسەر نیازەکەی خۆم هەر سوورم، وتیان دە غەفور مادام وای لێهات حەیف نی یە ئێمە بیەڵین تۆ بە تەنیا بڕۆیت ؟ ئێمەش لەگەڵت یەین، نەوەکا خوانەخواستە تووشی بەلایەك ببیت، با لە دووایدا پەنجەی خۆمان نەگەزین و بڵێین: ئێمە چۆن هاوڕێیەك بووین ؟ خەڵکیش تف و نەحلەتیمان بکات.

وەڵا برا ئیتر هەرکەسە ماوزەڕی خۆمان لێکرد بە شاناو بەو شەوە تۆف و بەفرە، لووس و باریك خۆمان لە ئۆردو دزی یەوەو ئاوای یەکە خۆت بگرەو هاتین. کە گەیشتینە ئاوایی، ئاوایی چی ؟ هەمووی شەش حەوت ماڵێك بوو نووستبوون کپ و خامۆش ئەت ووت خۆڵی مردووی کراوە بەسەردا. یەکەم دەرگا سووکێ کە لێمان دا، دووای کەمێك دەنگێك وتی کێیە ئەوە ؟ ئێمەش بە کوردیەکەی خۆمان وتمان: برا دۆستین و دوژمن نین لێمان بکەرەوە. ماڵەکە کورد بوون، ئاخر ئەو قوڵەش هەر کوردن ئەگەر چی شێوەی کوردیەکەیان کەمێك لەهی خۆمان ناچێت

بەلام زۆر چاك لەیەکتری تێئەگەین. بەڵێ کە دەرگا کرایەوە، پیرە مێردێکی سەرو ڕیش سپی سمێڵ زلی چوارشانە لەناو دەرگاکەدا وەستابوو، دیاربوو لەکاتی خۆیا زرتە بۆزێك بووە شانی لەو دیوارە بدایە ئەی ڕوخان. وتمان: خاڵە هیچ مەترسن، بەڵێ ئەسکەری عوسمانلین، بەلام ئێمەش وەك ئێوە کوردین و شەرەفی خۆمان بەلاوە خۆشەویستە، لەبەر ئەوە شەرەفی خەڵکیشمان بەلاوە بەنرخە. دڵت هیچ نەکات، لە خێر بەولاوە هیچمان بە دەستەوە نی یە، جا میوان ڕائەگرن ؟

کابرا کە زانی لە پیاوچاك ئەچین وتی فەرموون میوان سەر چاوان. کە چوینە ژوورەوە ئاگرێکی خۆشیان بۆ کردینەوە خۆمان گەرم کردەوەو ئەنجا وتم: خانەخوێی ئازیز ! چی بێ لەتۆ نەهێنی بێت، ئێمە ئەم شەو حەزمان لە حەڵوای ئاردی گەنم کردووە، جا ئەگەر پێتان هەڵئەسووڕێت، بە پارە بۆمان ئەکەن، بەخوایشت بۆمان ئەکەن، ئارەزوی خۆتانە ئێمە هەر مەمنونین. کە وام ووت کابرا بە پێکەنینێکەوە وتی: هەر ئێوەو حەڵوای ئاردی گەنم ؟ باوەڕتان بێ هەر بەدەم سەروگوێلاك کوتانەوەی سوڵتانی عوسمانلیەوە کە چۆن ئەم خەڵکە ئەدەن بە قڕ؛ دوو جگەرەکێشی پێ نەچوو کابرا تاوەیەکی گەورە حەڵوای هێنایە بەردەممان.

ئیتر کاکی برای هەر لەگەڵ دەستمان بۆ حەڵوایە بردو نەبرد، گوێمان لێ بوو لە ئۆردووەوە جەنگ بۆڕی سی لێدرا ! دەم و دەست فۆحلاو مامەوڕەحمان بێ ئەوەی دەستێك بۆ حەڵواکە بەرن؛ ڕاپەڕین بڕۆن. منیش پێم وتن ڕەحمان و فۆحلا ! هیچ خۆتان تێك مەدەن. بەو کەسەی کەئەم شەو نسیبی منی خستۆتە نمەکی ئەم ماڵە هەتا تێزو پڕ حەڵوا نەخۆم؛ ناجووڵێم. دەدانیشنەوە دانیشنەوە دەی با بۆڕی ژەن لەوێوە هەر زوڕنای خۆی لێدا. ئیتر ئەمە بێ ئێوە ناخۆش زۆر بە شێنەیی زۆر لەسەر خۆ چی حەڵوا لە تاوەکەدا بووە خواردوومانەو خۆمان لێ مڕ کردووە، بە زۆری زۆرەملێ پارەم خستۆتە گیرفانی کابرای خانەخوێ، ئەمە بۆڕیژەنیش لە ئۆردووەوە هەر فووی پیائەکات، ئەوسا ئێمە هەڵساوین.

ئینجا ئیتر غەفور وەرە باڵ لە خۆت پەیدا بکەو خۆت بگەیەنەرەوە ئۆردو.. واش ساردی کردووە تف هەڵدەی ئەی بەستێت، ئەوەنەی کەش بەفری تێکردووە دەشت و دەر لوس بووە. جا ئەوەی ئەو شەوە بەسەر من هاتووە بەسەر

سەربزێوی یە . دادال ئۆغلو دەمڕاستی دژ بە زۆرەملێ جێنشین کردنی تورکمانانە . دەمڕاستی ئەو سەربزێوی و یاخیبوونانەیە کە لە سەدەی یازدەمین بەملاوە درێژەیان کێشاوەو هەر لە گڕو بڵێسەدا بوون . دانەچیایش هەر لەم بابەتەیە . ئەشقیایەتیشی هەر لەم ڕەنگەیە . بەهەڵە یا بەڕاست ئەشقیا یاخییە . لە ئێنجە مەمەددا من ئینسانی « یاخی » م نووسی ڕەنگ و ڕەوەی مرۆی سەربزێو و یاخیم دارشت .

**- یەکێ لە نووسەرەکانمان دەیگوت دادال ئۆغلو سەمبولی کۆنەپەرستیی ئەو تورکمانا نەیە ، ئەو تورکمانانە ڕەوەندانەی چقورئۆوایە کە ساڵەهای ساڵ لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا تێکگیرابوون و هەمیشە دەستەوبەرۆکی یەك بوون . یانی عوسمانی دەیویست لەسەر بارێکی لەبارتری ژیانیان دامەزرێنێ ، کەچی ئەوان تا دەهات هەر بەلای بارێکی کۆنەپەرستردا دایان دەتاشی و لەدژ عوسمانی دەوەستان . دادال ئۆغلۆ دەنگی ئەم لەدژوەستانەیە دەنگی کۆنەپەرستی یەو چی و چی .. لەم جۆرە قسانە .**

- ئەمن بۆ خۆم لە مەڵبەندی ئەو ڕاپەڕین و هەڵستانە لەدایك بووم . تەنانەت لەگەڵ هێندێ لەوانی هاوبەشیی ڕاپەڕینەکەشیان کردبوو ، بووم بەئاشنا . خۆ جاری یەکیان هەبوو ، هەر بۆخۆی کۆنۆنەکەی پاریسی کردبوو . هۆزە تورکمانەکان هەویاو ئاواتی هەرە گەورەیان ئەوەبوو ڕۆژێ لەڕوخان دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەدژ دەوڵەتی عوسمانی بۆخۆیان پێکەوەبنێن . دەوڵەتی عوسمانی کە دەستی بە لاوازبوونی کرد ، ئەم تورکمانانیش بوون بە دەوڵەتی نیوە سەربەخۆ کوڕی دولقەدەر « ذوالقدر » سەربەخۆ بوو . ئەم هەڵستان و ڕاپەڕینە هەڵپەو تەقەلایێ بوو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێ . ئەم هەڵستان و سەربەرزکردنەوەیە ، بە تێکۆشان بۆ دامەزراندنی دەوڵەت هەویاو ئاواتی هەرە بەشەرەف و بەداوو دەستوورانەی مرۆڤایەتی یە . سەربزێوی و هەڵستان لە ئەنەدۆڵ ڕەگ و ڕیشەی لەنێو داب و دەستووریدا زۆر قووڵ و ڕەگداژۆیەو پشتاوپشت بۆی ماوەتەوە . لەناو کرۆکی داب و نەریتیدایە . بە هەزاران هۆزان و بەیتبێژ ئەم هەڵستان و سەربڵیندکرد نەوەیان بەزمان هێناوە : هەڵستان و یاخیبوون لەدژ بۆ یەمەن ڕەهەنە کردن ، قات وقڕ ، گرەو گەرما . یاخیبوون لەدژ عوسمانی . کەواتا دادال ئۆغلو بە کۆنەپەرست بزانین و ناوی لە دەفتەر بسڕینەوە ؟ کەوابوو سێرڤانتس چونکە باسی فیودالی کردووە ، دەیسڕینەوە ؟ کەوایە بلا یونانی کۆن و هۆمیرۆیش بسڕینەوە . دادل ئۆغلو دەسڕینەوەو بەمە دەبین بە پێشکەوتخواز . ئەمە بەتاڵکردنەوەو ئاشبەتاڵ پێکردنی تەنانەت کولتووری کلاسیکی مرۆڤایەتی یە ، لە کەلەپووری ساڵەهای ساڵی ئادەمزاد لاریبوونە . قەرەجە ئۆغلان لەبەرئەوەی وەلامی ئەوین و دلداریی ئەم چەرخ و چاخەیش دەداتەوە ، ئەویش هەر کلاسیکە . تا هەست و نەستی بنەڕەتی مرۆڤایەتی نەگۆڕێ سایکۆلۆژییەت و نەفسییەتی نایەتە گۆڕین . دادال ئۆغلو لەگەل گەلەکەیدا لەدژ عوسمانی هەڵستاوەو یاخیبووە . سەری داناوە . ڕەهەنەکراوە . کوژراوە . بەزیون . شکاون . سەرتۆپێکی عەشاماتێکی زۆرو زەوەندی تورکمان ، بە دیاربەکردا ، بەیۆزگاتدا پەرت و بڵاوکرانەوە . جا ئەم دادال ئۆغلووە ، بە برای خۆم بڵێم ، شاعیری مرۆڤایەتی یە . هی دەرەبەگایەتی نیە .

**- جارێکیان بە نووسەرێکیان گوتووە ، تۆ نووسەری پرۆلیتاریا نیت ، نووسەری بۆرژووا ، نووسەری دەرەبەگایەتی ، بە کۆنەپەرستیان نێوبردووە ، ئەویش بەوە زۆر پەست دەبێ ... بە ناوی ئەم بۆرە تاوانبارکردنانەوە شتی ئاوهایش ڕوودەدا .**

- دایکۆڵەکەم ، ئەمن هێندە گوێ بەم گەمژەیی یانە نادەم . تەنانەت هەر لەسەر ئەمە ئاخاوتن و پەیڤینیش بە زیاد دەزانم . پێموایە ئەم جۆرە کەسانە هەر بۆ ئەوە خاسن پێیان بخەنی و تێپەڕی .

**- بەلام چدەکەی ، ئەم مەسەلەیە ئەمرۆکە زۆر لەباوە کێشەیێکی زۆری لەسەرە . چۆن دەبێ هەروا بەپێکەنینەوە بەسەریدا بازدەین ؟**

- بەڵێ ، مەسەلەیە کێشەی زۆر لەسەرە ، بەلام بابەتێکە هەر بۆ ئەوە باشە دەبەر گاڵتەو تیزو تەوسی دەی . یانی ئەو ئینسانانەی بەجارێ لە ڕەسەنایەتی داشۆراون ئەم قسانە دەکەن . ئەوکەسانە دەیکەن فریان بەسەر هیچ ڕەسەنایەتی یەکەوە نەماوە ، نامەوێ قسە بکەم ، شوورەیی یە . هەر بەڕاستی عەیبێکی گەورەی سەقافەت و کولتوورە . ئەمە لەگەڵ قسەی « ڕۆماننووسی گوند » دا چ فەرقی نیە . من هەر لەبەرئەوەی گوندو گوندیم نووسیوە ، نابم بە ڕۆماننووسێکی خراپ ، بەڵکو من تەنها لەبەرئەوەی ڕۆمانی خراپ بنووسم ، دەبم بە ڕۆماننووسی خراپ . چاکە ،

ئێستا ئێمە بە فەقیر بایقورت بڵێین « ڕۆماننووسی خراپە ، چونکە ڕۆماننووسی گوندی یە » لێمانلە عەیبە ناگیرێ ؟ بەلام « ئەگەر بڵێین فەقیر بایقورت لەبەرئەوەی بۆی نەلوا بەهرە لە سەقافەت و کولتووری گەورە ، سەقافەت و کولتووری مرۆڤایەتی ، ئەو سەقافەت و کولقوورە گەورەیەی لە ناوجەرگەی خەڵکەوە شەوق دەداتەوە ، وەربگرێ ، لەم ڕووەوە ڕۆماننووسی خراپە » و بەمەیش قەناعەت بێنین هەنگین ڕەنگە بتوانین ، بڵێین ، قسەیەکی ڕاستمان کردووە . بە ئەحمەد عارف بگوترێ « شاعیری دەرەبەگایەتی » عەیب و شوورەییی هەرە گەورەیە . عەیبی هەرە گەورەی سەقافی یانە ئەحمەد عارف ڕەنگە شاعیری هەرە نوێباو مۆدێرنی چەرخی بیستەم بێ . بۆچی ؟ چونکە یەکێکە لەو شاعیرانەی چاکترین داکۆکیی لە مەسەلەی پرۆلیتاریا دەکا . چونکە ئینسانێکە سەری لە پێناوی هەراوکێشەی ئینسانانی ڕەنج خوراو دا داناوە . چونکە ئەحمە عارف نموونەی هونەرمەندی ئایدیالی چەرخی بیستەمە ، لەبەرئەوە . ئێمە نالێین ئەحمەد عارف شاعیری دەرەبەگایەتی یە . بەڵکو ئەحمەو عارف ئینسانێکە بەهرەی لە سەقافەت و کولتووری گەورەی ئەنەوڵێ وەرگرتووە . ئەحمەد عارف پیاوێکی بوعدفرەوانی گەورەی ڕابردووە . پیاوە هەرە سەرپەرەکەی چەرخی بیستەمە ، مۆدێرنترین و نوێباوترین شاعیری چەرخی بیستەمە . یانی جورە ئینسانێکی تازەبابەتە .

ئەحمەد عارف لە جۆری ئینسانێکی تازەبابەتە . لە جۆری هەرە تازەبابەتی ئینسانی شەڕو هەرای سۆسیالیستە . یەکێکە لە شاعیرە هەرە ڕاستەقینەچی یایەتی و هەرە کەڵەکانی چەرخەکەمان . پیر سوڵتانیش تیپی هەرە ئایدیالی چەرخی خۆیەتی . دادال ئۆغلویش ، یونس عەمرەیش ، قەرەجە ئۆغلانیش ، ناظم حیکمەتیش . سەقافەت و کولتوور بەش بەش کردن و پچڕپچڕکردنی ، بەپێی چین دابەشکردنی هەڵەیەکی گەورەیە ، زۆر هەڵەیە .

**- باشە ئەگەر وابڵێین : بڵێین « پرۆلیتاریا لە سەردەمی خۆیدا خاوەنی هەرەڕاستەقانیی . هەرەدوایینی سەرتۆپی سەقافەت و کولتووری مرۆڤایەتی یە » چدەڵێی ؟**

- زۆر ڕاستە « لینین » یش گوتوویە هەر وای لێ دێتەوە . قسەکەی « لینین . بەم قسەیەی تۆیە ، دەق وەك ئۆی گوتووە .

**- چاکە کۆمەڵگاکان لەپێشەوەچوونیاندا ، لەم گۆڕانە چێنایەتی یەدا ، لەم گەشەکردنە چینایەتی یەدا . هەر تیپە کۆمەڵگایەك ، تیپە مرۆی خۆی دیاری ناکا ، شەقڵ و مۆرەی خۆی پێوە نانێ ؟ واتا ، هونەرمەند ، کە لەم سەقافەت و کولتوورانەوە بەڕێ دەکەوێ ، چۆن چۆنی خۆی دەکا بە خاوەن گۆڕانێکی لە مرۆدا دێتە گۆڕێ ؟**

- ئەمە سەرەنجامی لە دنیای خۆبیانی بوونە و ناچاری یە ، واتا ئاکامی لە ناچاری نامۆکەوتنە . لە سەرلەبەری سەردەمی ئەو هەموو پەڕینەوەو ڕاگوێزانانەدا هونەرمەندی گەورە گەورە پەیدا دەبن .

- یانی مرۆیش دەگۆڕێ ؟

- دیارە دەگۆڕێ . کە دەوروبەرو بارودۆخ گۆڕا مرۆیش دەگۆڕێ .

**- زۆر بەجێیە . چاکە مرۆ کە هەمیشە لە گۆڕاندایە و دەگۆڕێ ، ئەوانەی سێرڤانتس و شێکسپیر گوتوویانە ، بەجێیان دەزانن .**

**- چۆن ؟**

**- مرۆ ئەمرۆ زۆر گۆڕاوە ؟**

**- لە ڕووی سایکۆلۆژی یەوە ؟**

- لە زۆر ڕووەوە . دەڵێم ، لایەنی وا هەن لە مرۆدا ناگۆڕێن . مرۆ زۆر خێرا گۆڕابا ، ئەمڕۆکە ، نووسینی نووسەرەکانی سەردەمانی رابردوومان نەدەخوێندەوە .

مادامێکی مرۆ فیزیاوی یانە ناگۆڕێ ، ئەو نووسەرانەیش کۆن نابن . سایکۆلۆژی یەتی مرۆ ، بەدرێژایی چەرخ و چاخان بێ وچانی یەك دەنوێنێ . شادی و خۆشی یەك ، ئێش و ئازارێکی لە سەردەمی یونانی کۆنەوە کەوتبێتەوە ، ئێمە تا ئەوڕۆکەش لە دڵ و هەناوماندا دەیانژێنین .

شا ئۆدییوس تا ڕۆژی ئەوڕۆکەیش دەژین ، هەروەکە خۆ چۆن بوو ، دەق ئاوهای دەژیێنین . کوڵوکەسەرەکەی ئاخیلۆس تا ئەمڕۆکەیش لە دڵ و دەروونماندا دەژین . ئەو ئازاری [illegible] شا پریامۆس لە داواکردنەوەی لاشەی کوڕەکەیدا [illegible] ی پێ دەکرد ، ئێمەیش هەستی پێ دەکەین ئەمڕۆ ، کێ [illegible] ی پێ ناکا ؟ ئەو ئازارە گەورەیەی جگەرگۆشان . پێم وایە ، تا بنیادەم لەدایك ببێ ، تا بنیادەم زگ وزا بکا ، تا بنیادەم داك وبابی

هەبێ ئەم ئازارە هەر دەژیێن .
- با هەمان دە ردو ئازار لە دایك و باوكی دەنیزو یوسف و حوسەین و هەرچی رۆڵەی كوژراوی دیكە هەن ، لە خۆیان بپرسین ، بزانین ، ئەوان چدەڵێن ؟
- دەق وەك یەكن . ئەگەر عەلی ئەلوێردی كوشتنی دەنیزی بە ئازاردان پەسندكردبا ، هەی بە گوریی ئاخیلوس بێ باوكی دەنیزیش دەق وەك شاپریاموسی ئیلیادە بە هەمان شێوە پارانەوەی باوكانە لاشەی كورەكەی لەم سەردەمەدا بە هەمان شێوە ، لە عەلی ئەلوێردی داوا دەكرد ، بەلام عەلی ئەلوێردی وەك ئاخیلوس وەجاخ زادە نەبوو ، لاشەی دەنیزی نەدایەوە بە باوكی ، دەنا ئەویش دەبوو بە داستانێكی دیكەی ئەم چەرخەمانە . سێرەییكی بێ ئێش و ئازاری ئادەمزاد هاتە گۆڕێ بەلام زۆریش نەگۆرا . ئاخیلوس دەیتوانی سەری پریاموسیش ببڕێ و لەتەنیشت سەری كورەكەیەوەی دانێ ، بەلام نەخێر ئەو وەجاخ زادە بوو . هەرچی عەلی ئەلوێردی یە وەجاخ زادە نیە ، ئەمە دەزانین .
**- دەچمە نێو باسێكی دیكەوە . لە رۆمانەكانتدا سەرەتای « مەتەڵ » زۆر پێ دادەگرێ . لە مەسەلەی مەتەڵدا ، وەك بزانم ، خۆتی گەیاندنی بەتامت هەن تەنانەت تۆ دۆنكیشۆتیش وا وەسف دەكەی ، كە چیرۆكەكانی وەك مەتەڵ بەسەر زاری خەڵكەوە دەگەرێن .**
- گێرانەوە هەر ئەو گێرانەوەیە ، بۆیە وا دەڵێم .
**- ئەوجا « حیكایەتخوان » پشت پێ دەڵێن . نەك پەسن دانت ، بەڵكو بۆ شكاندنت وات پێ دەڵێن .**
- دەزانم ، ئەوانەی داستان چاك دەزانن ، ئەوانەی شێوە گێرانەوەی سەرزاری خەڵك چاك شارەزاو پسپۆرن ، ئەوانی داوو دەستووری دەماودەم چادەزانن ، كاتێكی « دونكیشوت » دەخوێننەوە زۆر بەسانایی دەزانن ئەم كارە لە دەفتەردا نووسرانی داوو دەستووری دەماودەمە .
**- دەق وەك دەدە قورقوت .**
- دەق گێرانەوەكەی « دونكیشوت » وەك گێرانەوەكەی دەدە قورقوت وایە . جارێكیان لە پسپۆرێكی ئیسپانیولیم پرسی ، گوتی « بەڵێ زارگوتنی نێوخەڵك ئەوەیە وا لە « دونكیشوت » دایە . دیارە پێشتر ، خەڵكی بڕێ مەتەڵو چیرۆكی شۆرەسواریشی لەنێو خۆدا دەگێرایەوە . نەقڵو

سەرگورۆشتەكانی سێرڤانتیس زۆریان بەوانەوە بەندن : بەو مەتەڵە كۆنانەوە زۆر بەندەن . هەر بەرەی مرۆیێ بگری ، ئێپۆپەی خۆی لەگەڵ خودا هێناوە . تۆلستۆی چۆنی مەتەڵان هەڵگوێزتوون شێكسپیر گوتێ ، چۆنیان لە ئەفسانەی كۆنرا هەڵگوێزتووە سێرڤانتسیش لە ئەدەبیاتی دەماودەمی پێشەخۆوە بەرێ كەوتووە . لەپاش دادال ئۆغلو ، دەنۆری سەدان دادال ئۆغلو هاتوونە گۆرێ لە چقوورئۆوا . رەگو ریشەی چیرۆك و مەتەڵ ، هەروا دەكەی ، لە هیندستان ، لە چین دەبینییەوە . دۆنكیشۆت یەكەم نموونەی رۆمانە لە رۆژاوا . دەنۆری یە تەكنیكی ، وا تێ دەگەی حیكایەت و مەتەلن بووبن بە بەستەو سترانی سەرزاری خەڵك . هەرچی رۆمانی خۆمانە خێوی داب و دەستووری دوو هەزار سالەیە . هۆمیرۆس لەسەر ئەم خاكە ژیا . داستانی كوێر ئۆغلو بەلای منەوە ، داستانێكی هاوچەرخی بێ خەوشە . تەنانەت لە ئیلیادەدا دەتوانین تووشی خۆرووپی و تایبەتێتیی رۆمانی سایكۆلوژیی هاوچەرخیش بێین . بەش بەخۆم ، كە « حیكایەتخوان » م پێ دەڵێن ، كوڵێ شانازیم بەخۆدا دێتەوە . ئەوان بۆ شكاندنم وەم پێ دەڵێن ، بەلام بوون بە حیكایەتخوان شتێكە جێی شانازییە . دەبا بیرلەوە بكەینەوە ، بزانین مەتەڵێ چۆن لەدایك دەبێ ؟ بلا بیر لە مەتەڵێ بكەینەوە . هەزار سال ، دە هەزار سال ، یا سێ هەزار سال لەئەنەدۆڵ لەدایك بووبێ . ئەم مەتەڵە دەگێردرێتەوە ، لە سەدان كورو كۆمەلاندا ، لە هەزار گوندو دێدا . خۆ مەتەڵو چیرۆك وەنەبێ هەر مەتەڵبێژەكە ، تەنیا هەر خۆی دایهێنێ ، گوێدێریش مەتەڵ دادێنێ ، ئەویش بەشی خۆی دەگووڕێنێ . مەتەڵو چیرۆك دەق وەكو ئەو چەگل و چەوانە وان ، چل هەزار سال لە بن ئاودا مابنەوە ، شۆرابنەوە ، لێك و لووس بووبن ، مشت ومال بووبن ، زاخاوو جەلاو ئارایشت داربن . لە ئاكامی رەنجی ئەم حەمكە ئینسانە ، لەئەنجامی ئەم هەموو ئارەق رشتنە مەتەڵو چیرۆك دێنە گۆرێ . بۆ بەنوپلەی بێ قوسووری گەیشتنی ، كارێكی هەروا سانا نیە . مەتەڵۆكەیێ میلیۆنها خەڵكی تێ وررووكاوەو دایانهێناوە . بەو جوانی و زیوایی یە گەیشتنە ، پەی بەو سادەگی یە بردنە لە كێشی مندا نیە . من حكایەت و چیرۆك و داستانبێژێكی كەم نەفسم ، بەو نوپلە گەیشتنە لەتوان بەدەرە . ئەوانی بۆ شكاندنی من وام پێ دەڵێن لە گەمژەیی

خۆیان وەمپێدەڵێن . وێڕای ئەوەش ئەگەر نووسینەکانم نەختۆکەیەك لە مەتەڵان بچن زۆرم شانازی بەخۆیەو بەزیادبێ ، یانی ئەگەر بەوسادەیی‌و ڕەوانی‌یە نەگەیشتبم ، ئەوەی من بۆ ئەدەبیاتی تورکم کردووە دەبێ بە دۆستایەتی‌یەکی زۆر سەرسامکەر ... ئەمە بە گەشەکردنی دەزانم بۆ ئەدەبیاتی تورك . واتا ، ئەگەر نەختۆکەیێ لە مەتەڵ نزیككەوتنەوەم لێ وەشابێتەوە . بەو سادەیی‌و ڕەوانی‌و بێخەوشی‌یە گەیشتنە ، قەت ناکرێ‌و ناشێ بۆ ئینسانێکی وەك مەمانان ، بۆ تازە لە ئەدەبیات هەڵچوویەکی وەك مەمانان ، بۆ زەلامێ تازە دەستی دابێتە قەڵەم‌و لە ئەدەبیات نووسیندا بگاتە جوانیی مەتەڵان نووسینەکانی ، بەو بەهرەیە گەیشتن هاسان نیە . من ئەوەم لەبەر گران نیە نووسینەکانم وەك مەتەڵ دەچوێنن « کە زۆرم پێناخۆشە » خۆزی لەبەرئەوە لەپێش چاوی خەڵکیان ڕەش‌کردبام ، کە نووسینەکانم لە مەتەڵ دەچوێنن ، نەخێر ، سەبارەت بە شتی دیکە ئەو شەکرانە دەشکێنن . هەربۆیەش زۆر شانازی ناکەم . بە نموونە : « ئەفسانەی چیای ئاگری » بەنموونە : « کاریتە » بەنموونە : « زەوی ئاسن‌و ئاسمان مس » ، « گیای نەمران » ، بەنموونە « ئەفسانەی هەزار کەڵەگایان » نم گوتووە ، لەبەرئەوەی وشەی « ئەفسانەم » م بەگەڵخستوون لێیان کردم بە هەرا : « ئەها دزمان گرت ، دیتمانەوە کوڕینە ، هێزە بیگرن ، ئەمەیە ، کوت‌ومت ئەمەیە مەتەڵ ، دەی بەقوربانە ، بە سەرو گوێلاکی وەربن .

کابرا مەتەڵ دەنووسێ . شتی لە وڵات بەدەر دەنووسی ، « ئیدی لێم بەهەنجەت کەوتن ، لە منیان کەوێ ، ئەمما بەهەنجەت کەوتن . بەڵام خۆ « کاریتە » ڕۆمانێکی مەجازیی ڕەمزی‌یە . نەك هەر ئەوەندە ڕوویشی داوە . قەوماوە . ئەم ڕۆمانە بە شایەتیی خۆم قەوماوە . ڕەمزێتیی ئەم ڕۆمانە پێنج قامك بەرەژوور ، پێنج قامك بەرەخوار ژیانی مرۆڤە . ژیانی مرۆڤایەتی‌یە . ئینسان پێش سەدان ساڵ دایکی خۆی ، بارو بنەی خۆی بەمجۆرە ڕاگوێزتووە . هەر لەبەر هەندێکەشم نێوناوە « کاریتە » . کاریتەو کوڵەکەی ژیان بریتی‌یە لە خۆڕاگری‌و بەرگەگری مرۆڤ . دوێکە ، نووسەرێ لە نۆرویجەوە هاتبوو ، ویستی گفت‌وگۆیەکم دەگەڵ سازدا ، پرسی : « مەبەستت چیە لە هەموو ڕۆمانەکانتدا ؟ » دەسبەجێ گوتم ، بەتەنیا وشەیەك : « خۆڕاگری » . « کاریتە » خۆڕاگریی مرۆڤایەتی‌یە . کۆڵنەدانی مرۆڤایەتی‌یە ، سەرسەختی مرۆڤایەتی‌یە ، هێزو گوڕو توانی مرۆیە ، مرۆی نەبەز ، مرۆی بە هیچ‌شتێ کەوی نەبوو ، مێ نەبوو ، نەخەساو ، بۆڕنەخۆر . خۆڕاگریی ئەو ئینسانەیە کە مرۆڤایەتیی لەو هەموو پەتاو تاعوونە بەسامانە ، لەو هەموو تێداچوونانە لەو هەموو هەژاری‌و دەستکورتی‌و ڕەنجەڕۆیی‌یانە ، لەو هەموو قات‌و قڕو برسێتی‌و توینێتی‌یانە دەربازکردووەو تا ئێرەی هێناوە ... » . ئەوەی من واقم لێ وڕماوەو دەمەوێ بە داستانی بنووسم ئەوەیە « کاریتە » ڕەمزی ئەوە . کاتێ تنۆکێ ئاو بەر ئەو خۆڕاگری‌یە دەکەوێ ، کاتێ مرۆ تەنگەتاو دەبێ ، یانی کە « زەوی دەبێ بە ئاسن‌و ئاسمان دەبێ بە مس » کە باران لە ئاسمان نەباری‌و گیا لەسەر زەوی نەڕوا ، ئنسان چدەکا ؟ مرۆ خۆی بە خەونێکەوە هەڵداواسێ . واتا : ئەمە ڕۆمانی لە ناچاری‌یان ، لە ناهومێدی‌یان ، پەنا وەبەر دنیای ئەفسانە دنیاى خەون‌و خەیاڵ‌بردنی کۆمەڵێکە « زەویی لێ بووبی بە ئاسن‌و ئاسمانی لێ بووبێ بە مس » وا شپرزەو تەنگەتاو بووبێ ، هیچ دەرەتانێ ، هیچ دەروویەکی بۆ نەمابێتەوە . هەرچی « گیای نەمران » « ... [ بەرگی سێیەمی سێیینەی : کاریتە ، زەوی ئاسن‌و ئاسمان مس ، گیای نەمران . دووەمم بەدەستەوەیە وەختە خەلاسی بێ ـ وەرگێڕ . ] ئەمیش ڕۆمانی تاکە مرۆیەکە ، دنیای بەم پان‌و بەرینی‌یە لێ وێك‌دێتەوەو « زەوی دەبێ بە ئاسن‌و ئاسمان دەبێ بە مس » ، یانی مەمیدیك [ پاڵەوانی ڕۆمانەکە ـ وەرگێڕ ] لە گیای نەمران » دا دنیای خەون‌و خەیاڵێ بۆ خۆی ڕۆدەنێ ، پەنای پێدەبا . ئەمە ڕۆمانێکی ڕەمزی‌یە ، گوتم ، ئەمە ئەوەیە : مرۆ کە دەکەوێتە ئاستەنگ‌و بەجارێ ناهومێدی ڕووی تێکردووە ، تەنانەت لە سەردەمی هەرەقات‌و قڕو نەهامەتیشدا ، لەم چەرخەی ئێستاشماندا ، دیکتاتۆری دروستکردووە ، کەلەگای دروستکردووە . لەپاش شەڕی یەکەمی جیهان نەتەوەی ئەڵمان ناچار هیتلەری دروستکردووە ، یەکێتی‌ی سۆڤێت ناچار ستالینی دروست کردووە . چار ناچارە . هیچ چارەیێ نیە . ئەو خەڵکە بلێ‌و نەلێ پەنا وەبەر دیکتاتۆرێ هەر دەبەن . ئینسان بە درێژاییی مێژووی هەر دایتاشیوەو پەنای وەبەر بردووە . ئەمە

هەڵاتنێکە . من لە سێینەی « کاریتە ، زەوێ ئاسن وئـاسمان مس ، گیـای نەمـران » دا لە شتێ گـەڕاوم لە حـەقیقـەتی ئینساندا هەیە . ئەویش ئەوەیە : کە ئینسان تا چ ئەندازەیەك بـە خـەون و خـەیـاڵ دەژی ، تـا چ ڕادەیـەك دەتـوانێ لەو ناوڕاستینە ماددی‌یانەیدا تێیاندا دەژی ، دەربـەڕێ . ئێستا لەم ئانانەدا دەژین . تا چ ئەندازەیەك لە خەون و خەیاڵدا این لەم ترووکە ژیانەی ئێستاماندا ؟ تا چ ڕادەیەك لە نێوڕاستیدا این ؟ کەوشەن و سنووری ئەمە بەڵەد نین . ئەمن لە ڕۆمانەکانمدا بەم سەرحەدو سنوور تێ‌هەڵکێشی یـەوە ، بەم بێ‌سنـووری‌یەوە خـەریکم ، ئـەم کـارە دەکـەم . لە « ئـەفسـانـەی چیـای ئاگری » دا ، لە « ئەفسانەی هەزار کەڵەگایاندا ، تەنانـەت لەجیاتی « ئاغاکانی ئاقچەساز » یشدا ویستم نـاوی گشتیی ئەم ڕۆمانەیش هەر « ئەفسانەی ئاقچەساز » بنووسم . من لە هەموو ڕۆمانەکانمدا ویستم تێ‌هەڵکێشیی سەرحەدو سنوور ، بێ‌سنووریی ژیانی خەون و خەیاڵ ، ئەفسانە ، مەتەڵ ، واتا ئەو دنیا دووەمەی مرۆ بۆخۆی دەیهێنێتە گۆڕێ پیشان بدەم . « ئەفسانە » م هەر لەبەر هەندێکە بەکارهێنـاوە ، بۆئـەوەی بتوانم قسەکانم پتر زەق‌وزۆپ کەم ، بۆئـەوەی بتوانم چـاتر دەردو ئێش و ئازارەکەم دەربڕم . چونکە دۆزینەوەی سنووری خەون و ڕاستی ، سنووری ڕاستی و ئەو خەون و خەیاڵەی مرۆ دروستی‌دەکـا ، بەو نیشـانەو گێلەڕێ و ڕەمـزانەوەی خـۆی دایـان‌دەنێ ، لەنێـو ئـەو ڕاستی‌یـەیـدا ، تێـدا دەژی زۆر هەستەمەو دژوارە . [ لێرەدا سێ شت بەبیردا دێ : خەون و خەیاڵ ، ڕاستی ، واقیع ـ وەرگێر ] ئەمە بـە ڕۆمان لە مـرۆ گەیاندن کارێکی زۆر سەخت و تووشە . گوتم هەر هیچ نەبێ ، بە ناوەکانیاندا ، با سەرەداوێ بەدەست خـوێنەرەوە بـدەم ، تێی‌بگـەن . بەرەی ئینسـان لە خەونیشـدا و لە ڕاستیشـدا تێ‌هـەڵکێش دەژی . گـوتم بـابێ بـە سـەرەداوێ بـۆیـە « ئـەفسانـە » م لە کتێبەکـانمـدا ، بـەکـارهێنـا . تـەبیعی لەبەرئەوەی کە ئەدەبیاتی ئێمە هەرگیز لە گاڵتە بەدەر پێشوازی لێ نـاکـرێ ، لێـکـۆڵەوەکـانمـان ، هـاوڕێ‌یـانمـان ، ئەدەبیات‌شناسەکانمان ، ڕۆماننووس و هـونەرمـەندەکـانمان لەگـاڵتـەبـەدەر پێشـوازی لێ نـاکـەن ، لەبـەرئـەوەی زۆر خەمخوارانەو مشوورخۆرانە ئاوڕ لە ڕیبازەکانیان نادەنەوە ، دەڵێن ، « کابرا چیرۆکبێژە » و زۆر بەهاسـانی پیاو بـەدناوو بـۆسۆ دەکـەن ، یا بـەجارێ پـەڕوبـاڵی پێـوە نـاهێڵن . بـە جیدی‌یەت و خەمخۆری‌یەوە لە هونەرمەندێ ناکۆڵنەوە . لەناو ئێمەدا هێشتا لێکۆڵینەوەو تـەرزە بیرکـردنەوەی وا گـەشەی نەکردووە . تـەنانـەت تائێستـا ، لە چەنـد کەسێ بتـرازێ ، لێکۆڵەوەی لێکـۆڵەوەی ڕاست و دروستمـان نیـە . لێکـۆڵەوە دروستی ئـەدەبیاتمـان نیە . ئـەو لێکۆڵەوانـەی داکـۆکی لە بیروبڕوای خۆیان بکەن ، ئەوانەی کەسایەتیی ئەدەبیی خۆیان هەبێ ، زۆر کەمن . بەنموونە : سەعید فاییق جیهانبینی‌یەك ، لە جیهان گەیشتنێکی هەیە ، بەڵام لێکۆڵەوەیێکی جیهانبین . بیچم لێکۆڵەوەیێکی لە جیهان گەیشتوومان نیە . ئەوی بەرەو ئەم ڕووکارە دەڕۆیشت ، فەتحی ناجی بـوو . ئەویش لەبـەر ناڵەباریی بـارو دۆخ هەل‌و مـەرجی زۆر کارکـردنی کەم بـۆ ڕەخسا . بەڕاستی من ئـائێستا تـووشی لێکۆڵەوەیێکی چـاك نەهاتووم . ویستم لەمەڕ « ئاغایەکانی ئـاقچەسـاز » یشەوە هێندێ شت بڵێم . بەنموونە : تا هەنـووکە ئـابووری‌شنـاسێ نەهات ، بڵێ ، « ئەم نووسەرە ڕۆمانی ئەو ماوەیەی نووسیوە کە دەرەبەگایەتی لە چقورئۆوا تەواو گەشەی کردبـوو و پێی هاویشتبووە سەرمایەداری‌یەوە ، نەیگوت ، « ئەمە ڕاستە ، یا هەڵەیە » . من لەو دوو بەرگەی تاوانی بازاڕی ئاسنگەران » و « یوسفی یوسفوکە » داجۆرێ بیروبڕوای وام گوتووە ، لە وڵاتی خۆشمان و تەنانـەت لە سەرانسـەری دنیایێ‌یش ، زۆر کـەم گوتراون . گوتوومە ، « کاتێکی چینەکان دەگۆڕێن ، بتەوێ و نەتەوێ سرووشتێش لەگەڵ خۆیاندا دەگۆڕین . » من ئەمەم بە چاوی خۆم دیت . شایەتی دەدەم . سرووشتی دەرەبەگـایەتی ئاوهابوو ، کە چووە نێو سەرمایەداری‌یەوە ، سرووشت ئەم بارو شێـوەیەی وەرگـرت کە دەیبینی . ئـاوهای بـەسەرهـات کە دەیبینی .

ـ لە « ئاغاکانی ئاقچەساز » دا

ـ بـەڵێ . لەبەرئـەوە دەبینی دوایی هاتنی دەرەبـەگایـەتی و هیشك‌بوونی ئاقچەساز لە یەك‌ئاندا ڕێك‌دێن .

لە سەرێکەوە ، کاتێکی ئامێری زل‌و زەبەلاح کەفچەی خـۆیان دادەگـرن و دواخاك و خـۆڵی نێـوان ئـاودرگـەکـەیش ڕادەماڵێ ، دەرویش بەگیش لەودەمـەدا بەنـاچاری یـوسفی پیاوی خۆی کـە ڕەمزی دەربـەگایـەتی‌یە لە ڕۆمـانەکـەدا ، دەکـوژێ . لاشەی کـورە لەگەڵ ئـاوەکـەدا ، لەگـەڵ ئـاوە

« ئیرکمیش » ەکەدا ، « ئیرکمیش » واتا بە سەدان ساڵ لەوێدا « چاوەنۆڕ کردووە » دەڕواو حیکایەتەکەیشی شان بەشان لەگەڵیدا دەڕوا .

**- ئەمەیە مانای « ئیرکمیش » ؟**

- ئەم وشەیە بە واتای زۆر چاوەڕێکردوو هاتووە . ئەمەیش تائێستا کەس بەبیریدا نەهات . پێموایە ئەوانەی دەیاننوسم ئەگەر ڕاست بن لە ژیانی مرۆڤدا زۆر بەبایەخن : گۆڕانی سروشت لەگەڵ گۆڕانی چینەکاندا ، ئەمە بۆ یەکەمجار ، موبەججەل کرای ، بە ڕادیۆ باسیکرد . زانایانە باسیکرد . ئەو ی ئەمەی لە من گەیاند هەر ئەوبوو ، من بۆخۆم لەوەوە لەم مەسەلەیە گەیشتم . بەڵام موبەججەل کرای لێکۆڵەوەڵێ نیە ، پرۆفیسۆرێکی سۆسیۆلۆژیيە ، بە موبەججەل کرایم گوت « موبەججەل » گوتم ، دۆستێکی کۆنمە ، « من بۆخۆم دەمویست ئەمە ئاوها بکەم ، بەڕاستی زۆرم کەیف بەوجۆرە چارەسەرکردنە هاتە وە ، بەڵام ، گوتم ، « باشە ڕۆماننووسە گەورەکانی سەدەی نۆزدەیەم » کە ڕۆماننووسی ڕاستەقانی ئەوانن ، « بۆچی » گوتم ، « بۆچی پێوەندیی ئەم چینەو سروشتیان پێش من نەنووسیٚ ؟ » وەڵامەکەی موبەججەل ئەمەبوو : گوتی ، « ئەم ڕووداوە لە ئەورووپا ، یانی لە دەرەبەگایەتی‌یەوە پەڕینەوە بۆ بەری سەرمایەداری وچانێکی دووروودرێژە ، » گوتی . « ڕۆماننووسەکان لەم وچانە دووروودرێژەدا گۆڕانی سروشت و کۆمەڵگایان شان بەشانێ یەك پێکەوە نەدیت . هەرچی تۆی لەپرێکدا تراکتۆر هاتە نێو ژیانتەوە لە ساڵی ١٩٤٦ دا ، لەپڕ . ڕەوەن و قەرەقاچ نەمان ، لەناکاو ژاژەڵان و قەمیشەڵان نەمان ، ئاوو زەلکاو زۆنگ و زەمەندو قوپی نەمان ، لەناکاو دارو دوخت نەمان ، لەپڕ لێڕو جەنگەڵ نەمان . پەپوولە ، باز ، قوشقەڵە ، هەوێردە ، هەڵۆ ، خەرتەل ، سەرگەڕ هەموو ڕایاندا ، سروشت نەما ، بەجارێ تەواو بوو و بڕایەوە . سروشتێکی نرت‌ونوێ .. » ئاوهای گوت . وە ئەمانە سەرانسەریان کێڵدران لە چقورئۆوا . لێڕو جەنگەڵیش کێڵدران . هەرچی‌یەکی تۆ دەیبینی دەکێڵدرێ لە چقورئۆوا ، جونکە دنیای سەرمایەداری دەیەوێ « لەسەر خاکە بەپیتەکانی » وەك چقورئۆوا . لە هەر زەڕڕە خاکێکی سوود وەرگرێ . سروشت ماوە ، مردووە ، ئەو سەروبەندی خۆی دەزانی ، ئاننده دەزانی یەکسەر ، چەوساندنەوەی خۆی دەخاتە کار . هەر دەڵێی مووی بۆ هەڵدەکروزری ، لە حەوت ڕۆژە ڕێگاوە بۆنی سوودی خۆی دەکا . دنیای سەرمایە داری مرۆ چۆن دەچەوسێنێتەوە ، سروشتیش بەوئاوایە دەچەوسێنێتەوە . بەنموونە ، هەروەك کەس بیری لەم ڕۆمانانە نەکردەوە هەروەهایش بیریان لەم ڕاستی‌یەیش نەکردەوە . تەنیا هەر گوتیان : « ئەمانە ڕۆماننووسی گوندین . » سەبارەت بەوە کە باسی گوندی دەکەن ڕۆماننووسی خراپن » گوتیان و لە کارەکە وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون . لەو سەردەمەدا ، لە دەرەبەگایەتی‌یەوە ڕاگوێزان بۆ سەرمایەداری ، ڕەسەنایەتیی مرۆیش لە گەڵ سروشتدا بەرچاو دەکەوێ ، ئەمیش ڕوو لە داشۆران و کەڵك‌لێبڕان دەکا . ئینسانەکان لەم ڕاگوێزانەدا یا بەیەکجارەکی دەپەڕنەوە بەری سەرمایەداری ، یا ، ئەگەر بیانەوێ لە شوێنی خۆیان بمێننەوە ، وەك شەخس ڕەسەنایەتی‌یەکەیان دەدۆڕێنن ، دادەشوورێن ، لە ئینسانەتی دەکەون ، گەڕ دەبن ، نەخۆش دەکەون ، نامێنن ، دەبڕێنەوە . بنۆڕی‌یە دەروێش بەگو مستەفابەگی ئاق‌یوڵلو ، دەبینی ئەمانە مرۆگەلێکن بەدووای تۆڵەی خوێنی دووسەد ساڵەدا دەگەڕێن ، کێشەی بەدوا تۆڵە گەڕانەکەدا لەپڕ دەبێ بە یاری منداڵان . یەکیان بە خەیاڵ دەرویش بەگ دەکوژێ ، ئەوی‌دیکەیان هەست بە دۆستایەتی‌یەکی زۆر سەیر دەکا بەرانبەر بە مستەفابەگ ، سەبەب ؟ چونکە ، دنیایەکی نرت‌ونوێ هاتووە ، جغزی بە چوار دەوردا کێشاون و لەناوەندیدا ماونەوە ، یانی لەنێو چەمبەری ئاگردا هەرکان بەتەنێ ماونەوە . وەلەدووادووایيدا کە هۆردوکیان دەبڕێنەوە ، مستەفابەگ ئێکجار بەسام چاوەڕێی دەرویش بەگ دەکا . کە دەمرێ ، ئەوی دیکەیش بێ‌کات بە فیرۆدان یەکسەر ، بۆ دیتنی دەچێ . هەردوکیشیان لەسەر نەمان و بڕانەوەن ، ڕەفتەنین . وە هەردوکیان بە بتوونی لە ناوجەرگەی نەماندان ، وە تا دێ هێندەێ دیکە لێك دەئاڵێن . یەکیان کوڕەکەی سووکایەتیی پێ‌دەکا ، کۆمەڵگا سووکایەتیی پێ دەکا ، دایکی ، ژنەکەی سووکایەتیی پێ‌دەکەن. ئیدی لە چەرخ‌وچاخی ئەو سەردەمی بەدەرن ، بە تاکی تەنیا دەمێننەوە ، ئەمە دەبێ بە کارەساتێکی بەسام . دەبێ بە کارەساتێ وەك کارەساتە بەسامەکە ی گریکان . لەناوچوونی چینێ مردنیشی ، هێندەی مردنی شەخسێ دەبێ بە کارەسات ، بەقەدەر مردنەکەی دەبێ بە ڕووداوێکی تراگیدی . ئاکامێکی زەق و زۆپ . مردنی چینێکیش ڕووداوێکی تراگیدی‌یە . کارەساتێکی بەسامە . با شتێکی سەرنج‌کێشتان لەمەڕ ئەم ڕۆمانە عەرزکەم . لاوێ بە « سەرسامی دەرەبەگایەتیی » ی

وەسپ‌کردم . جا بەڕاستی ئەو دەرەبەگایەتی‌یەی تورکماتان ، بێ‌کەم‌وکووڕی‌و بێ‌قووسوور بـوو . خێوی بـڕێ لەو قییەم‌و بەهایانە بوو کە مرۆڤایەتی پشتاوپشت هێناونی . خێوی بەهای دۆستایەتی ، بەهای جوانی ، بەهای خۆشەویستی ، بەهـای سروشـەکـردن ، بـەهـای سـەرڕاسـتی‌و ڕاسـتـگـۆیـی ، بـەهـای‌بـەزەیی ، بـەهـای بـزەو پێکـەنـین ، بـەهـای لە ساغی‌یەکی بەسامی مرۆبوون . خێـوی تۆرەی خـۆیان بوون . ئەمنیش هەڵبەتە ، سەرسا می ئەم پێوەندی‌یە پێکەڵەو موکەممەلانەی ئینسان بووم . بە نموونە : بابەتی « سوڵتـان ئاغا » یەك لەم ڕۆمانەدا هەیە . سوڵتـان ئاغـا پەنـای وەبەر قۆناخێ هێناوە ، سەرلەبەری دنیا بین ، نایدەنە وە . کەچی لە دوایی ڕۆمانەکەدا ، لەتەواوبوونی « یۆسفی یۆسفۆکە » دا ، دەدرێتەوە بە داواکەرانی ، داواکەرانیش وەری‌دەگـرنەوە ، لەتوپەتی دەکەن ، تـووڕی داوێنە نێـو کەلاکی هـەڵۆیان . چـونکـە هـەڵۆیش نـەمـابـوون ، ئـەوانیش دەورووبـەریـان بەسەرچووبوو . هەڵۆیش یەك لەو سەرەتایانەی سروشتەکە لەنێو برابوون لەوێندەر . لاشەی داب‌و نەریتی هەرە گەورەی دەرەبەگایەتیش لەسەر سروشت فڕێ‌دەدەن ، کابرای پەنابەر بەدەستەوە دەدەن . تەسلیمی دەکەنـەوە ماڵەخـۆی . ئیدی داب‌و دەستـووروو عەنعـانیش نەمـان . هەرمن پـەسنی ئەم قییەم‌و بەها ئینسانی‌یانە بەتەنێ ، نادەم خۆ ، مارکسیش ئەمە دەڵێ . ئـەم تێ‌گـەیشتن‌و مـەفهـوومـەی من تێ‌گـەیشتن‌و مەفهوومی مارکسە . لە فیـودالیزم ، لە ئینسـانی سەردەمی دەرەبەگایـەتی ، لە قیمەت‌و بـەهای مـرۆڤایـەتی دوواوە .. مارکس لە دەستنووسەکانی 1844 دا لەوە دوواوە ، ئینسان چۆن بەدەستی سەرمایەداری لە ئینسـانەتی دەخـرێ‌و بەجـارێ تێك‌وپێك دەشکێندرێ . دەڵێ ئینسانانی سەردەمانی پێشووتر لەگەڵ قی‌یەم‌و بەها ئینسانی‌یەکانی خۆیاندا زۆر ڕاستگـۆترو دڵسۆزترو پێوەندتربوون . کارێکی ئێمە دەیکەن هەر ئەوەیە ، سـەرلەنوێ لەگـەڵ قییەم‌و بـەهایـەکانی مـرە ڤـایـەتیـدا دەست‌لەملان‌و شادو شوکور دەبنەوە . ئەدی سۆسیالیزم ئەوە نی‌یە ، مرۆڤایەتی بکـەینەوە بـە خاوەن ڕەسـەنایـەتی‌یەکی دێرینەی خۆی کە لە دەستیان چوواندووە ..

**- کاتێکی کۆمەڵگایەکی بێ‌چین‌و چینایەتی دێتەگۆڕێ .**

- بەڵێ ، مرۆڤایەتی جارێکی دیکە قییەم‌و بەهـایەکـانی خۆی بـەسـەر دەگـرێتـەوە ، سـەرلەنـوێ دەبێتـەوە بـە خێـوی ڕەسەنایەتی‌یەکی لە ناهەق لە باری بردراوە . ئەوەی گرینگە دەبێ پێش لە کلك‌وگـوێ‌کردن‌و ڕەسـەنایـەتی لەباربـردن بگیرێ . بە لە نامۆکـەوتن‌و بیانی‌کـەوتن بگیرێ . یـانی یەك لەوانەی مرۆڤایەتیی ئێکجار زۆرتر بـریندار کـردووین لە دنیا بیانی‌کەوتنە ، مرۆڤایەتی خـۆی لەو دنیا پـان‌و بەرینـەدا بە غەریب‌و نامۆ بزانێ ، وەك بە تاقی تەنیا بژی ، وەك هیچ فریکی بەسەر هیچەوە نەبێ ... ئەم ڕۆمانە ڕۆمانی جۆرە نامۆکەوتن‌و لە دنیـای خـۆ بیـانی کـەوتنێکـە . واتـا ، دەروێش‌بـەگ‌و مستەفابـەگ جۆرە دۆنکیشـۆتێکی چقورئـۆوان . کارەسـات « تـراگیدیـا » یەکی بـەسامـە . ئەمن بـۆخۆم ئـەوە ژیام . حیکایەتی چقورئۆوا حیکایەیکی ئێکجـار بەسـامە . کـاتێکی بـەرگی سێیـەمی « ئـاغـاکـانی ئـاقچـەسـاز » دەنـووسم‌و دەیخوێننەوە ، دەبینن .

**- زۆربەی زۆری کتێبەکانت بە زمانە ڕۆژاوایی‌یەکانیش لەچاپ‌دراون ، گوتت ، لێکۆڵەوانی تورکیا ، بەوجـۆری خۆت بۆی‌چـووی ، لە ڕۆمانـەکانیـان نەکـۆڵیویـەوە ، ڕاستە . بەلام ڕۆژاوا بەوجۆرە تێ‌ی‌گەیشتوون ؟**

- بەنموونە : لە ئیسویچرە « ئەفسانەی هـەزارکەلەگـایان » دەورووبەری شێست ـ حەفتا بەڵێ لەسەر نووسرا . لێکۆڵینەوەیی ئێکجار دووروودرێژن بروانە ، دووانووسین ئەمەیە : نووسینی لێکۆڵەوەیێکی ئسویچرەیی کە نێوی رووث هـالدێنە یەك لەو نووسینانەیە کە خۆشم‌لێ‌هات . دەڵێ : « وێنەکێشانە زگاکەکانی پەشـار وەك وێنەکێشـانە زگمـاکەکـانی ڤان‌کـۆخ دەچن ،» ئەمە لەمەڕ « ئەفسانەی هەزار کەلەگایان » دەڵێ . دەربارەی « گیای نەمران » یش پارەکە ، نووسەرێکی دیکـە پەیدابوو ، ئۆلۆف لاگێر گرانس ، شاعیری گەورەی ئیسویچرە بـوو . سەردێـری نووسینـەکە ئـەمەبـوو : « هۆمێـرۆس لە ئەنەدۆڵ » ، لە ئیسویچ تەنیا کەسێکی لەگەلیدا ئاخاوتبێتم هەر ئەو بوو . ئیدی لەگەڵ کەسێکی دیکەدا قسەم نەکرد . چونکە لەوێ کـارم دەکـرد . پیـاوەکـە پێ‌گـوتم : «ئـەمن زۆرم لە ئەدەبیاتی دنیـا کۆڵیـوەتەوە تـەنیا نـووسەرێکی لەم دنیـایە سورگون نەبووبێ ئێـوەن » گوتی . وا هـەست‌دەکەم لەنێـو دەروونمدای ، وادەزانم هەمیشە لەگەڵ گەلەکەتدای‌و بستێکی لێ هەڵنابڕێی . سەرتۆپی نووسەران ، خواروو ژوور ، لەباری سورگونیدان . تاکە نووسـەرێکی سورگـون نەبـووبێ تۆی » گوتی . زۆریش بەمە شادم ، پێم‌وابوو چاکم تێ‌گـەیشتووە . چـونکە ئـەمن وەك هـوشیـارێ ، وەك خـوێنـدەوارێ لەنـاو گەلەکەمـدا ژیاوم . هـەشت ساڵ لەنـاو « پارتی کـرێکارانی

تورك » دا ، لەناو وەنەوشەی گوندەکەمدا هەموو لاوێنیم لەگەڵ گەلەکەمدا ، بەسەرچوو . هەر بەڕاستی خۆم هەرگیز بەسورگون نەزانی . هەر لەم ڕۆژانەدا نووسینێ لە « نیویۆرك تایمس » دا بڵاوبووەتەوە . لە جۆزەرداندا نووسینێکی جۆن دۆمیسیۆن ، ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسا لە « فیگارۆ » دا بڵاوبۆوە . بەڕاستی پیاو هەق بڵێ ، چاك لە « زەوی ئاسن و ئاسمان مس » گەیشتووە . یانی لێکۆڵەوانی هەتدەران ، بەتایبەت ئامریکایی یەکان لە هەموان چاترم ئێ دەگەن . لەم وتاری لە « نیویۆرك تایمس » دا بڵاوبووەتەوە . نووسەرەکەی دەڵێ ، « یەشار کەمال لە تۆلستۆی ، لە تۆماس هاردی دەچوێنن ، کەچی هەروەك خۆیشی دەڵی ، پتر لە فۆلکنەر دەچێ ، چونکە دەوروبەری ئۆکلاهامای فۆلکنەر کە تێیدا ژیاوە کوت ومت چقورئۆوایەکەی یەشار کەماله . » ڕەنگە ڕاست بێ . ئەمنیش ئەگەر بۆخۆم ، لەوچەرخەدا نووسەرێ هەبێ هەست بە نزیکایەتی یێی بکەم ، هەر فۆلکنەرە . پێموایە لە سرۆشت گەیشتنمان زۆر لێك دەچن . لێم بپرسن کێیە نووسەر لە نووسەرانی ئەم چەرخە پەسند دەکەی ، دەڵێم فۆلکنەر . ئەمە نزیکایەتیی ئاوو گڵە . گرەو گەرما هەر ئەو گرەو گەرما ، لۆکە هەر ئەو لۆکە ..

**ـ بەڵام بە هەمان شێوە دەبڕین نیە .**

ـ تەبیعی ، هەر ئەوشێوەیە نیە . وەناشبێ . چۆن دەبێ ، ئەو لە بەندو باوێکی دیکەوە هەڵکەوتووە ، من لە بەندو باوێکی دیکەوە سەرم هەڵداوە . ڕەگ و ڕیشەی من ڕەگ و ڕیشەیەکە ، بە داستانەوە بەندە ، هەرچی فۆلکنەرە بە شیعری ئینگلیزی یەوە ، بە ڕۆمانی جێمس جۆیسەوە بەندە . ڕەگ و ڕیشەی ئەو ئینگلوساکسۆنە . ئەو تەرزی گێڕانەوەو دەربڕینی ئەدەبیاتی نووسراوەو ئەدەبیاتی دەماودەم تێك دەبەستێ ، ئەمنیش تەرزی گێڕانەوەی ئەدەبیاتی دەماودەم و ئەدەبیاتی تۆمارکراو تێك دەبەستم . ئەوەشێ یە لێکەوە نزیکایەتیمان . بەڵام لای ئەو تەرزی گێڕانەوەی ئەدەبیاتی نووسراو پتر پێ دادەگرێ . هەرچی یەکی منم ، تەرزی گێڕانەوەی ئەدەبیاتی دەماودەمم لەکن زێتر پێ دادەگرێ .

**ـ یەشار کەمال من پێموایە لە « ئاغاکانی ئاقچەساز » یشدا شێوازی دەربڕینی ئەدەبیاتی نووسراوت زێتر بەسەر قەلەمدا زاڵە .**

ـ لە تورکیا شتێکی لەگوێن « ئاغاکانی ئاقچەساز » ی من نیە لە ئەدەبیاتی نووسراوە دا . من بۆ خۆم ، هەر خۆم تەرزی ئەدەبیاتێکی نووسراو لەمەدا دەئەزموونم . یانی لەو ڕۆمانە بوعد فرەوانەدا تەرزە دەربڕینێکی نوێی وا دێنمە گۆڕێ دەشێ ببێ بە سەرەتایەك بۆ ئەدەبیاتەکەمان ، ئەگەر بیبێکێ شتێکی ڕووکەش نەبێ چەشنی دەربڕینەکەی .

**ـ گوتت ، دەئەزموونم .**

ـ دەئەزموونم .

**ـ تازە لە ئیسوێچەوە گەڕاویتەوە . لاموایە پێنج مانگی لەوێ مایتەوە ، وەنیە ؟ لەوێ چیی وات نووسی ؟**

ـ بەڵێ یەکیان ڕۆمانێکی کورتە . ناوی « باڵندەکانیش ڕۆیشتن » ئەوی دیکەیان ڕۆمانێکە هێشتا تەواوم نەکردووە . 500 — 600 ڕووپەڕێ دەگرێتەوە . ڕۆمانێکی بین‌درێژە . ناوی « دەریا کۆرا سەلیم » ە سێیەمیان هێشتا ناوم لێ نەناوە ، نیازم وایە لێرە پێوە بچم ، تەواوی کەم .

**ـ چاکە لەم ڕۆمانانەتدا بەتەمای درێژە بە ئەزموونی شێوازی ئەدەبیاتی تومارکراو بدەی ؟**

ـ خۆ وەنەبێ دە جۆر ، سەد جۆرە شێوازی دەربڕین هەبن بۆ ڕۆمان نووسین . زۆر بەقنیاتە . ئێمە تازە دەستمان بەم کارە کردووە . تەنیا بنەچەێك ، تەنیا کەسێکی سوودم لێ وەرگرتبێ ناظم حیکمەتە . لە شێوەی دەربڕیندا . شێوە دەربڕینی سەرزارەکی نێوخەڵکیش . بەنموونە : « کۆشکی بلووری »[1] . جا هەرچەندێکم توانیبێ کەڵکی لێ وەرگرم . تەنانەت سوود لە کتێبی چاپی بەردیش زۆر وەردەگرم . وێڕای ئەوەیش هەڵبەتە شێوازە داڕشتن و دەربڕینێکی خۆشم هەیە . بەنموونە ، ئێمە زۆر لە ڕۆمانی ڕووس شارەزاین . چاکی دەزانین . وەرگێرانی چاك چاك لە ئەدەبیاتی ڕووسەوە کراون . لەویشرا شێوازە دەربڕینێکم وەرگرتووە . قابیلە لە ستانداڵەوە شێوازی دەربڕین وەرنەگرم ؟ دەستم بە هەر ڕۆمانێ کردبێ لەپێشان ئەو دەخوێنمەوە . کتێبەکانی بوون بە کتێبی ژوورسەرم . هەڵبەتە سوودیان هەر لێ وەردەگرم ، ئەی چۆن ... خۆ هەر هیچ نەبێ ئەمانە شێوازی دەربڕین و داڕشتن ، دنیاکەم لەبۆ فرەوان دەکەن ، دەیان ڕەنگێنن ، جۆراوجۆریان دەکەن . بەش بەخۆم شێوازە دەربڕینێ لە دروست بووندایە ، ماتەی داوە . ئەمەیش ڕەنگە ، بەئەنقەست نەیکەم . بەنموونە شێوازی داڕشتنی هیچ ڕۆمانێکم وەك « لە بازاری ئاسنگەران » و « یۆسفی یۆسفۆکە » ناچێ . ئەمە سەڵت وقوڵت بە خوایشتی خۆت ، بە خواستی نووسەر پێك نایێ . کەواتا ، بابەتی نووسین ئەو شێوازە دەربڕین و

دارشتنە دینێ . حیکایەتێکی نێوخەڵکی دەماودەم مومکین نیە ، وای دەرنابڕی . سەروساختیان یەکەوە نیە . بەلام بێگومان سوود لەو داوو دەستووره گەورە وەرگرتنێ لە ڕەگو ڕیشەمدا هـەیە . حـەزدەکەی بـڕێ سەرەتـای شێـوازی دەربـڕینی دەمـاودەمی نێوخـەڵکت بۆ بـژمێرم لەوانی پـەریونـەتە نێـو ئەدەبیاتی سـەیکاغـەز . یانی دەتـوانم هەر لە « ئـاغاکـانی ئاقچەساز » دا لە کوێن رەگو ڕیشەی خۆم ، لەکوێن شێوازە دەربڕینی خۆم گەلێکت شت بۆ ببینمەوە . زۆر زۆریش . دوو ڕووبەڕە ڕست لەو کتیبەمدا هەن . ئـەدەبیاتی دەمـاودەمی نێوخەڵك ئەمەی تێدا نیە . بەلام ئەگەر شاعیرێکی دەماودەم شیعروێژی نێو خەڵك ویستبای شیعرەکـانی خەستوخـۆڵترو چڕتر دەبڕیبا ، دەیتوانی ئەمـە لە ئەدەبیـاتی سەر کـاغەزو تۆمارکراویشدا بەجێبێنێو لە ئەدەبیاتی زارگۆتیشدا . گەلۆ ، بۆچی گۆیا ، ڕووبەڕو نیـوێ ! دوو ڕووبەڕ ڕست بـەو جۆره دەکەم .

**- کێ نالێ هۆزانە بەیتبێژەکانی نێو خەڵك لە سەروبەندی خـۆدا وەیان نـەدەکرد ، بـەلام ئەو ڕستـە بێندرێـژانـە نەگەیشتوونە ئەمرۆکە . نابێ ؟**

- ڕەنگە ، ها !! . بەڕاست من بۆ خۆم تووشی ڕستی واهاتم . تـووشی شێوازە دەربـڕینی دەماوەمی نێـوخـەڵك ، شێـوازی دووردورێژ زۆر بووم .

- لەو شیعر شیعرێنانەدا ، لە شێناندا ..

- بـەلێ ، ڕاستە . شـەڕە شیعـر تـاكڕستن . ڕاستـە . زۆر ڕاستە . زۆرم سوود لەو مەتەڵۆك و شیعرشیعرێنانە ، بۆ ئەم ڕۆمانانە لێ وەرگرتـوون . شتی زۆر ڕەنگـینو جـۆراوجـۆر هـەن سـوودم لێیـان وەرگـرتبێ . « سەری بڕاوە ، زەقزەق تەماشادەکا » ئەمە مۆتیفێکە بەلام هێنـدە هەیـە ، ئەم ئـەدەبیاتـە دەمـاودەمی‌یـە هێنـدە زۆر پێ داناگرێ لەکنم .

**- شێوازی گێرانەوەت لەم ڕۆمانانەی ئێستا بەدەستەوەن دەیاننووسی ، چۆن دەبێ ؟**

- بەرەبەرە تا دێ ، بەرەو پەتی‌یەتیو سادەو لووسی دەڕۆم . نووسەران تا بەنێو ساڵدا پتر بچن ، ئەدەبیات تا پتر پێبگاتو بگەیێ زێتر بەرەو پەتی‌یـەتیو سادەگیو بێبـەزەكو دۆزەك دەڕۆن . بـەرەو پەتی‌یـەتی‌یـەکی بێسـەرو سنـوور دەچێ کارەکە . ئینسان دەبێ تا ڕادەی دەربڕینی بێوشە بڕوا ئەمن ئێستا وای بیر لێدەکـەمەوە . ئـەمن بیر لەوە دەکـەمەوە کـە ئینسان هێند بە ڕاشکاویو بێپەناوپـەردە ، هێند هـاسان ، هێنـد ڕاستەوخـۆ ، هێنـد بێگـرێوگـۆڵ بتـوانێ لە خـەڵك ڕاگەیینێ ، کە هیچ پێوە گیرنەخۆن . زۆر حەزم لەوەیـە . بە تاسەی ئەوەوەم . شتێ هەبێ دڵی پیاو خۆشکا ئەوەیـە . کە ڕۆژێ بێ ، ئینسان بتوانێ چەرخەکەی ، حەقیتەتی ئینسان ، حەقیقەتی سروشت وەك شیری بڕا ، ڕووپو ڕاست دەربڕێ . بێئەوەی هیچ شاخو باڵێك لە شتان بڕوێنێ . هیچ زێدەیەکی وەسەرخەی ، لە ئینسان ڕاگەیینی . « مێـرووە ڕدێنسووره شـەلەکـە » م شتێکە تـاڕادەیـەك تـێـدا بـەو پلەیـەی بەئەزرەتەوەییم بیگەمێ ، ئەوە بەدیاردێخی .

**- جیهانی ڕۆژاوا لە بابەتی ڕۆمانـدا زۆری پلە بڕیـوە ، پلەی گەورە گەورەی بڕیوە . ئەمڕۆکـە قسەی « ڕۆمـان مرد » لە ڕۆژاوا بەسەرزدەگەڕێ (زاراوەوە) . دەڵێن ئەمڕۆ لە ڕۆژاوا ڕۆمـان بەجـارێ لە کەلك بـڕاوە ، زۆری داوەتـە بـاری ڕواڵەتو شێـوازچێـتی ، کـە دەڵێـی ڕۆمـان ، واتـا : شێـوازەکەی ، ئـاو بە حـاڵە گەیشتـووە ئـەدەبیـات لە ڕۆماننووسیدا دەڵێن . بگرە لە مەیدانی دیکە دەگەڕێن ، لە ئارانو مەیدانی بەپیتو بەرکەت دەگەڕێن . بەنموونە ، ئەوەتا ڕۆژاوا زۆر بە ڕۆمانەکانی تۆوە خەریکنو زۆریان بـەتەنگـەوە هاتن پیشـاندەدەن ، ئەمـەیش لەپـڕێکدا ڕوویدا . یا ئەو بایەخدانە گەورەیەی کە بە ئامریکای باشووری دەدەن ، زۆر بایەخ بە ئەدەبیـاتی ئامـریکای باشوور دەدرێ . ئەمە تاسەو ئارەزوویەکـە بۆ ئـارانو مەیدانی نوێ . یانی ڕۆژاوا ، ئـەوەی خۆی نـایکا ، لە جێگایەکی دیکەی وەردەگرێ . کە لێیدەکرێ . ئێستا ئێمە لەمبارەوە سوودو قازانجمان چیە ؟**

- ڕۆمان نووسین ، کاری وەستاو شاگردە . لە ڕۆژاوایش بووە بە کاری وەستاو شاگرد . بەنمـوونە ، دۆستێکم لە فـەرەنسا هـەیە . دۆستێکـە زۆری ڕێز لێ دەکـرم . گوتی : لە دنیـادا ڕۆماننووسێکی لە هەمووانم پتر خۆشبـوێ تۆی » زۆرم لای سەیر بوو . ئەمە لەمێژیشە . لە 1961 دا بوو ، لە 1962 دا بوو . گوتم ئەمەی بۆچی پێگوتم . « بڕوانـاکەم » گـوتم . گوتی : « ڕۆمانێکی فەرەنسزی ئەوڕۆکە بێنن ، نێوی کەسەکـانی لە فەرەنسزی‌یەوە بگۆڕن ، بیکەن بە ئینگلیـزی کەس هـەستی پێناکا . نێوی کەسانی ئینگلیزی بکەن بە فەرەنسزی ، بڵێن ئەمە ڕۆمانێکی فەرەنسزی‌یە ، چـناقەومێ ، کـەس هەستی پێناکا »

ـ ئەمە لەکن مەش هەیە .

ـ گوتی : « هەرچی تـوی ، جیاوازی‌یـەکت هەیـە ، فەرقت هەیە . ئێستا نێوی فەرەنسزی ، یـا ئێنسگلیزی لە کەسـانی ڕۆمانەکانی تۆ بنێین ، نابێ سەرناگرێ » ، « خوێندوو قەناعەت بەو نێوانە ناکا . دەزانێ ئەوکەسانە ، نە فـەرەنسزین ، نـە ئینگلیزن » گوتی . « ئەتۆ ڕۆمانێکی تازەبابەت دروست دەکەی ئەوروکە » گوتی . ئەمرۆ سەرلەبەری مرۆڤایەتی لە شتی تازە دەگەڕێن ئەوەی ئێمـە هێناومـانەتـە گۆڕێ دەنگێکی نـوێ ، هەوایەکی تازەبابەتی نوێباوە لەچاو ڕۆژاوە . یـانی ڕۆژاوا تازە لێی وەخەبەرهاتووە ، تازە هەستی بەمە کردووە . ئێمـە بێچم و شێوازێکی تازە ، شێوازە دەربڕینێکی تازەمان ، وابزانم هێنایە نێو ئەدەبیاتەوە . بەنموونە . ڕۆمانێکی وەك « لەسەر زەوی‌یە بەپیت و بەرەکەتان » ی ئۆرخان کەمال بە شـاکارێ لەقەڵەم‌دەدرێ . بەنمـوونە : ڕۆمـانێکی ئۆرخـان کەمـال لە ڕۆمانەکانی ئامریکای باشوور زۆر چاترە بە لای منەوە . ڕۆمانی ئێمە زۆر ساغلەمتـرە . چونکـە ئێمە لەسـەر بنچی خۆمـان ڕوواویـن ، ڕیشـاژۆیـن ، لە ڕەگ و ڕیشـەی خـۆمـانـەوە هەڵمان‌داوەتەوە . هەرچی ڕۆمانی ئامـریکای بـاشوورە ، بـە قنیاتی خۆم ، کە زۆریشی لەسەر نووسرا ، ڕۆمانێکە لەژێر کاری سوریالیزمدا سەروبەر نراوە ، زیاتر بە ئاوو گڵی ئەو خەملی‌وە . سەقافەت و کولتووری خەڵکەکانی ئامریکای باشـوور لەگوێن سـەقافـەت و کولتـووری خەڵکـەکەی خـۆمان نیـە . پێم‌وایە ئەدەبیاتکارانی ئامریکای باشوور ..

**ـ بەتایبەت مەکسیکۆ .**

ـ بەتایبەت ئەدەبیاتکارانی مەکسیکۆ ، لەڕووی سەقافـەت و کولتوورەوە ، هێندەی ئێمە بە ڕەگ و ڕیشە نین ، کولتووری ئێمە ڕەگی قووڵە . سەبەبەکەیشی ئەمەیە : ئـەوان لە ئیسپانیـاوە ڕۆیشتوون بۆ ئەو وڵاتانە . هیچ بایەخێکیان بە سـەقافـەت و کولتووری خەڵکە نیشتـەنی‌یەکـەی ئەوێ نـەداوە ، یا هـەر بـەجارێ لەنێـویان داون و ئـاسـەواریـان بـڕیـونـەوە . جـا لەبـەرئەوەی لە سـەقافـەت و کولتـووری خۆیـان دابـڕاون و سـەقافـەت و کولتـوورەکەی خـۆشیان لە کـولتووری ڕۆژاوا دابـڕاوە ، کولتـوورەکەیـان کـولتـووری خـەڵکیکـە هێشتـا پێنەگەیشتـووەو تەواو نـەخەملیـوە . لە ئامـریکای بـاشوور کـولتوور ونکـردنی ڕووی‌داوە . سەبـارەت بەوە دەبینی بـە ساڵەهای ساڵ ، قەرەجـە ئۆغـلانێ لە ئەدەبیـاتی ئامـریکای باشووردا هەڵنەکەوتووە . پیرسوڵتانێ ، مەلا مەزبوورەیێ ، تەنانەت هەرگیز ناظم حیکمەتێ هەڵنەکەوتووە بـەنموونـە ، وەك لێزانان دەڵێن ، نێـرۆدایەك ، هـەرگیز نـەبووە بـە ناظم حیکمەتێ . سەبەبەکەش ئەوەیە : ئەدەبیاتی نوێی ئامریکای باشوور لە 19 دا دەست‌پێ‌دەکا . لە فەرەنسا . لە فەرەنسای 1900 دا سوریالیزم ، لێشاوی سوریالیزم فەرمـانڕەوایـە . لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا . ئاستووریاسەکان ، بڕێ ئـەدەبیاتنووسی ئامـریکای بـاشوور .. ئـەمـانـە هـەمـوو لە سەرچاوەی فەرەنسا ئاودەخۆنەوە و لەو سەروبەندەدا زۆر زۆر دەکەونە ژێر تەئثیری سوریالیزمەوە . جا لەبەر هەندێکی جۆرە ئەدەبیاتێکی فەنتازی لەوێ لەدایك‌دەبێ . بگرە تـا گابـریل ما .کزیشیان . هەرچی ئەدەبیاتی تورکە ، تا ئێستا یەکێکی وەك ئورتەزای ئەدەبیاتی تورك بەنموونە ، لە ئەدەبیاتی ئامریکای بـاشووردا نیـە . ئـەم‌جـۆرە نمـوونـەیـەی تـائێستـا تێـدا هەڵنەکەوتووە ، وە هەڵیش‌ناکـەوێ . بگرە نمـوونەیێکی وەك سەعید فایقیشیان نیە . حیکایەتنووسێکی وەك ئەویشیان نیە . ئەدەبیاتی ئێمە بۆچی بەسەر ڕاستـەرێ‌یە ؟ جـارێ یەکـەم شت ، ئێمە سەقافەت و کـولتوورێکی ڕاستـەقانی گـەورەمان هەیە . دووەم ، ئێمە زۆر چاك لە ئەدەبیاتی ڕووسی گەیشتین ، چاکی فێربووین . لەبەر باری جوگرافیایی ، سەبارەت بە باری هەل و مەرج ، سەبارەت بەوەی کە ستران و گۆرانی‌یەکانمان زۆر لێك‌دەچن ئەدەبیـاتی ڕووس لەکن ئێمە زۆر چـاك هاتـە حاڵی‌بوون و تەرجەمەی چاك چاکیشی لێوە کـرا . دێوێکی وەك شەڕو ئاشتی‌ی تۆلستۆی ، ئەم شاکارە گەورەیە ناظم حیکمەت کردی بە تورکی . وەستایەکی گەورەی وەك ناظم حیکمەت کردی بە تورکی ، لە بیرمان‌نەچی ! ڕەنگە سەبارەت بە لێك‌نزیکایەتیی سـەقافـەت و کولتـوور بێ لێك‌نـزیکـایـەتی‌یـەکی زۆریش ، تەرجەمەی ئێکجار چاکی لێ وەبەرهەم هاتووە . دەڵێن چاترین تەرجەمەی دنیا ، ئەو تەرجەمانەیە لە ڕووسی‌یەوە کراوان بۆ تـورکی دۆستویفکی ، چێخـۆف ... سەبـارەت بـەوەش کـە ئەدەبیاتی ڕووسی ئەدە بیاتێکی سفلەو رختەیـە ، زۆرمان بـەکـەڵك هـاتـووە . ڕەگ و ڕیشـەی ئـەدەبیـاتی ڕووسیش لەسەداسەد هەر بە ئەدەبیاتی نێوخەڵکەوە بەنـدە ، لەسەر بنچی دەماودەم ڕەگی داکوتـاوە . ناظم‌حیکمـەت لەکن ئێمە چۆنە ، پوشکینیش ، لە ئەدەبیاتی ڕووسدا شـاعیرێکـە لەنێو خـەڵکەوە ، لەنێـو ئەدەبیـاتی خەڵکـەوە سـەری‌هـەڵداوە ، شاعیرێکە کەڵەکەبوویـەك گووراندوویە ڕەگ و ڕیشـەی لەنێو ئەدەبیاتی دەماودەمدایە . لەبەرئەوەی ئەدەبیاتی ڕووسی بەو

دەستی پێ کردووە بە ڕەگ و ڕیشە ڕەسەنەکەی خۆیەوە زۆر بەتوندی ماوەتەوە . جا سەبارەت بەوەی کە ئێمەیش زۆر شارەزای ئەو ئەدەبیاتەین ، سەبارەت بەوەی کە خاوەن ڕەگ و ڕیشەی خۆشمانین ، یەکێکی وەك ئۆرخان کەمالمان لێ هەڵکەوتووە . ئەمن پێم وانیە یەکێکی وەك ئۆرخان کەمال لە ئامریکای باشووری بتوانی هەڵبکەوێ . ناتوانێ « مورتەزا » یەك بێنێتە گۆڕێ . ناتوانی « لەسەر زەوییە بەپیت و بەرەکەتەکان » و « کۆنەفرۆشەکەو کورەکانی » تێدا هەڵبکەون . باوەڕناکەم شاکارێکی وەك « کیسەڵەکان » ی فەقیر بایقورت لەوێ دروست ببێ .

ـ چاکە ئەدی بۆچی بە ئەدەبیاتێکی ئاوها بەبایەخ ناناسرێ ؟

ـ بەڵێ ، بۆچی « مورتەزا » یەك لەسەر ڕووی زەوی پەیدانەبوو ؟ جارێ باری سیاسیمان ، خۆئەوە هەر بەجارێ ، دیارە چەند ناڵەبارە . ئێمە وڵاتێکی سەر بە سیاسەتی دەرەکین ، داسداو تابیعیکین بەدەوری سیاسەتێکی دەرەکیدا دەخولێینەوە . ڕۆژاوا گوێ بە سیاسەتی تابیعێتی دەرەکی نادا ، بەتەنگ ئەو جۆرە کلکانەوە نیە . دووەم ئێمە زمانەکەمان زۆر لاچەپە ، زۆر چەپە کە . ئەوانەی لەم سەرزەوییە زمانی تورکی فێربووبن ، زۆر کەمن . گرفتی وەگێڕانیش کۆسپێکی زۆر گەورەیە . بەنموونە : تائێستا دە کتێبم کراوە بە زمانی ئیسوێچی . تەنیا یەکێکیان « ئەگەر مارەکە بکوژن » ، سەد ڕووبەڕێ دەبێ ، هەر ئەویان لە زمانی تورکییەوە یەکسەر کراوە بە ئیسوێچی . ئەوەیشی بەهۆی یەکێکەوە ، کە مەجەرییەك بوو ، زمانی تورکی دەزانی لە وەرگێڕاندنی کتێبەکانمدا لە ئینگلیزییەوە بۆ ئیسوێچی . من کتێبەکانم تەنها بە دوو زمان تەرجەمە دەکرێن . بەساڵی کەسەوە . یەکیان Thalda تێدا ، یەکی دیکەیان گوزین دینۆ ، سێیەمیان مونەووەر ئانداچ* . زمانی تورکی زۆر بێبەختە . بەنموونە : نەناسینی شاعیرێکی گەورەی وەك یوونس عەمرە ، بۆ تیرەی مرۆ ، بۆ سەقافەت و کولتووری مرۆڤایەتی کەموکووڕییەکی ئێکجار گەورەو ستەمە . تەنانەت یەکێکی وەك ناظم حیکمەتیش تاوەکو ئێستا دنیای ئینگلیز نایناسێ . تەرجەمە نەکرا . ناظم حیکمەت نێرۆدایەك نیە . کتێبەکانی نێرۆدا وەك ئاو دەڕۆن لە ئینگلیستان لە ئامریکا . ناظم دیار نیە . ناناسرێ . لە وڵاتێکی وەك ئیسکاندناڤیا ، فینلەندە ناظم حیکمەت دەناسن و بەس .

**ـ بەڵام ئەگەر ڕاست و دروست تەرجەمە بکرێ ، جۆرە سڵ و پرتینگانەوەیێ دێتە گۆڕێ ، وەنیە ؟**

ـ چۆن نابێ ؟ کە لە ئیتالیا وەریان گێڕا ، تا نێو گوندییانیش لێشاوی ئاژنی نا .

ـ لەگەڵ ئەوەیشدا کە گۆیا ، زۆر خراپیش کراوە بە ئیتالیایی .

ـ لە دنیای ئیسپانیۆلدا هەموو گوندێ ناظم دەناسێ . بەلای دنیای ئیسپانیۆلەوە کەڵە شاعیری گەورە نێرۆدا نیە . ناظم حیکمەتە . ئێستا لە فەرەنسا ، ناظم حیکمەت بە شاعیری هەرە گەورەی دنیا دەزاندرێ . چاك تەرجەمە کرا . یانی لە نێوچاوانی ئاستەنگ و ناڵەباریی وەرگێڕانەوە ، ئەو ئەدەبیاتە گەورەو گرانەی ئێمە لە هەندەران ناناسرێ . چاك تەرجەمە بکرێ ، ئەمرۆ ئۆرخان کەمال دەبێ بە مەشوورترین نووسەری ئەو دنیایە . بەنموونە فەقیر بایقورت هەموو ڕۆمانەکانی ناڵێم بەلام هەر تەنیا « کیسەڵە کان » کە ..

ـ پاشان « ماڵەغان » هکەی .

ـ ماڵەغان* فەقیر ئەمرۆکە تەنیا هەر بە « کیسەڵە کان » ی دەبوو ، بە نووسەرێ لە هەموو نووسەرانی دنیا ڕۆمانەکانی پتر دەفرۆشران . هێندە ، بە « کیسەڵە کانی فەقیرەوە دەنازم ، تەرجەمەکرابا ، هەرایەکی زۆر گەورەی لەڕۆژاوا دەنایەوە . پێم وایە هەرایەکی دەنایەوە . لە هەرای ئیسپانیۆل و باشووری ئامریکا زۆر گەورەترو بەبایەختر . ڕۆمانی ئەوڕۆی تورك . تەبیعی ئەگەر تەرجەمە بکرێن . لام وایە شیعریشمان هەروایە ، ئەویش هەرای گەورە دەنێتەوە . ئەحمەد عارف ، ئەحمەد عارفێ بکرێ بە فەرەنسزی ، وەك بۆمبا دەتەقێتەوە . دەڵێن تەرجەمەکردنی ئێکجار زەحمەتە . بڕوا بەمە ناکەم . ئەحمەد عارف تەرجەمە دەکرێ . زۆر بەهاسانیش . چونکە ئەحمەد عارف شاعیرێکی ڕیشاژۆیە ، شاعیرێکی دەماودەم بێژی بە ڕەگ و ڕیشەیە . قسەو گوتەی ڕەسەن و ئەسڵ هەموو سەروەختێ تەرجەمە دەکرێ . ئەحمەد عارف پیاوێکە قسەکانی زۆر ڕەسەن و بەڕەگن . یانی لە ناوجەرگیەوە ، لەناو هەناوو دەروونیەوە قسان هەڵدەکەنێ و دەیانڵێ ، یان وشە و ڕستێ بەکاردەبا تامشتووان لەنێو دڵ و هەناوی ختمن . شیعری ئەحمەدعارف زۆر قووڵە ، بنی ئێکجار دوورە . جا هەر لەبەر هەندێکەیشە زۆر بەهاسانی تەرجەمە دەکرێ ، زۆرم بڕوا بەمەیە . شتێکی دیکەیش هەیە ڕۆمانی ئێمە جوراوجۆرن . بیچم و شێوازی جۆربەجۆریان هەیە . بەتایبەت ، بەشی بەحاڵی ڕۆمانەکانی .

خۆم قسان دەکەم . چونکە کارێکی خۆم کردوومە چاتری

تێ دەگەم . لە ڕۆمانەکانی مندا هیچ جۆرە . بیچم و شێوازێکی ڕۆژاوایانە نابینی یەوە . هی خۆمەو هەر لە خۆم دەوەشێتەوە ، نەبێ بە خۆمەڵکیشان . ڕۆمانەکانم لە گۆرانی یەکانمانەوە ، لە تەرزی داڕشتنیاندا ، لە قورمیش کردنیاندا ، لە یاپی و بنیادنان و میعماری یاندا لە گۆرانی یەکانمانەوە ئاودەخۆنەوە ، دەقاودەق وەك گۆرانی یەکانمان هەڵنراون .

**- یانی چۆن ؟**

**- ڕۆمان میعماری یەتێکی خۆی هەیە . دەربڕین و گێڕانەوە ، قورمیش کردنیکی خۆی هەیە . گێڕانەوە ئەوە دەردەخا ، یانی ئەو قوورمیشە تەرزی گێڕانەوەی ڕۆمان دروستی دەکا ، ئەمن ڕۆمانەکانم زۆر لە گۆرانی و لاوژەکانمان دەچن . گۆرانی یەکانی لای خۆمان ، لە ئەنەدۆڵی ، بە هەمان رستۆ قسە دووایی یان دێ . گۆرانی و لاوك و حەیرانەکانمان زۆریان بەوچەشنەن بەوردی لە ڕۆمانەکانم ڕامێنی ئەوەی لیریکی و گۆرانی ئامێزی یان تێدا دەخەملێنی ئەو قورمیشەیە . یانی هێندە لەسەرەتا گوتن پێ دانەگری ، جۆرە یەکنەواختی یەك ، چەشنە یەکنەسەقی یەك ، تەرحەیەك هەوایی یەکیش بەکاربێنی . تەبیعی « بازاڕی ئاسنگەران » و « یوسفی یوسفوکە » لەمانە بەدەرن . تەنانەت لە « بازاڕی ئاسنگەران » یشدا بەرانبەر بەمە ، ئاسەوارو نیشانەی هەر هی خۆو تایبەتی پێوە دیارە . چاپکی و لیریکایەتی « گۆرانی ئامێزایەتی » ی ڕۆمانە ئەوە بەدیی دەهێنێ لە قەوارەو بارستی « بازاری ئاسنگەران » دا لە فرەوانییدا ، لە زۆر نموونەو جۆراوجۆری کەسەکانیدا چەند نموونە کەسی تێدایە ، نازانم ، سەدن ، سەدو پەنجان ، بگرە دووسەدیشن ڕۆمانێکی ئاوها هەمەرەنگ ، هەمەچەشن ، ئەوەندە بەهێز شتی وا لە ڕۆژاوا نادۆزی یەوە . ئەمەیش چی ئیسپاتی دەکا ؟ ئەوە ئیسپاتی دەکا کە چەند بە ڕەگەو ڕیشەی خۆمانەوە بەندین ، ئەو شێوازە ئیسپاتی دەکا لە دەدە قورقوت ، لە کوێرۆغلووەوەمان وەرگرتووە . سرەکە لێرەدایە ، لەم بیچمە کولتوورەدایە . بیچم و شێوازی ڕۆمانیش کولتوورو سەقافەتێکە .**

**- دوێکە ئێوارە . لە جێگایێ گفتوگۆیەکی ئاواوایی ڕوویدا : یەکێ لە برادەرانی بەڕێزو خۆشەویستم گوتی : چەرخەکەمان چەرخێکی ئیدی زۆر خێرا دەژی زۆر بەپەلە دەژی . تەلەفیزیۆن فەزا ، نازانم چی و فلان ، خوێندووی دنیا ئیدی شێکپیرو سێرڤانتس و بیلزاك وەك** جاران ناخوێنێتەوە . چونکە ئەو نووسەرانە لەم ناو دنیا بە پەلەو خێرا گوزەرانی یەدا بە سست و قورسی دەزانن .

**لەگەڵ پێی ژیانی ئەمڕۆکەدا دەرناچن . هێندێ کتێب ناخوێندرێنەوە ئیتر . ڕووداوێ نیە بۆ سبەینێی هەڵگری . شتی نیە بۆ سبەینێ‌ ببینێتەوە ، پەزێرە دەبێ . خوێندوو حەوسەلەو بوڕدەباریی خوێندنەوەی ڕۆمانی بەبەرەوە نەماوە ، برادەرەکەم ئاوهای دەگوت . تۆ چدەلێی لەم بارەیەوە با ئە مە دوا پرسیارم بێ .**

- ڕۆمان تا دێ ، پتر دەخوێندرێتەوە . ئەو حوکمەی برادەرەکەت داویە هەر بەتەواوەتی هەڵەیە . تەبیعی ژمارەی ئینسانان زیادی کردووە . بەلام ئینسان دەیەوێ پتر فێربێ ، ئەمەیش هەیە . دەیەوێ زۆر فێر بێ ، قەت تێرناخوا ، هەڵبەت کلاسیکەکانیش مردنیان بو دەمرن . هێندێ کلاسیك سەروەختی خۆیان گوزەراندووەو دەڕۆن ، لە باو کەوتوون . بەلام ئەو کلاسیکانەی سەروبەندی خۆیان پیرنەکردوتەوە ، هێشتا دەوری خۆیان قەپات نەکردووە ، تابێ زێتر دەخوێندرێنەوەو خوێندووی زۆریش بۆخۆیان دەبیننەوە .

**- یانی ئەو برادەرە دەیگوت ، ئیلیادەی هۆمیرۆس ، دۆنکیشۆتی سێرڤانتس ئیدی چیی تێدا بەستە نیە ، چیی لێ هەڵدەکرێندرێ بۆ ئەمڕۆ .**

- چۆن چیی تێدا بەستە نیە ؟ هەر بەتەواوەتی هەڵەیە . تا ئینسان نەگۆڕێ ، ئەوانەی هۆمێرۆس و سێرڤانتس گوتوویانە ناگۆڕێن . ئینسانیش بەمجۆرە دەگۆڕێ : لەوانەیە کلکی هەشت مەتر درێژ ببێ ، مێشکی ، سەری وەك لوولەی لێ بێ ، چوزانم ، دەبێ بە سێ بەشەوە ، یانی سەری دەبێ بە سێ فلیقانە ، سێ قولوو ، هەشت دانە گوێچکەی دەبێ ..

**- یانی گۆڕانێکی فیزیکی . « فیسیۆلۆجی »**

- چوزانم ، بنیادەم ببێ بە شتێکی تر ، هەر بەجارێ ببێ بە شتێکی زۆر جیاواز ئەوساکە گۆڕانێکی سایکۆلۆجیش ڕوودەدا . واتا : ئەگەر ئینسان بوو بە شتێکی دیکەی جیاواز ، نەفسی یەتیشی دەگۆڕێ دیارە .

**- یانی کە لە ئینسانەتی دەردەچێ .**

**- بەلێ ، کە لە ئینسانەتی دەردەچێ . کە دەبێ بە شتێکی جیاواز بەنموونە ، وەك هەلۆ بفرێ ، چوزانم ..**

**- یانی لایەنی‌وا لە ئینسانەدا هەیە نەگۆڕێ .**

- هەیە . بەلام کلاسیکەکانیش کۆن‌دەبن . وەك هەمووشتێ چۆن کۆن دەبێ ، ئەویش کۆن دەبێ . ئەویش ماوەیەکی خۆی ، ئەویش دەوری ژیانێکی خۆی هەیە . بەلام ئەمە لە گۆڕانی مرووەنایە ، لەبەرئەوەنیە ، ئینسانەکە گۆڕاوە ، لەبەر ئەوەیە کلاسیکەکە کۆن‌بووە ، سەردەمی بەسەرچووە ، لە بەئتدوَ باو کەوتووە . ئینسان شرۆ شکڵێکی جیاواز وەرناگرێ ، بەڵکو دەچێتە نێو بارو دۆخێکی دیکەوە ، دنیاکەی دەگۆڕێ . ئەو کلاسیکانە وایان لێ دێ ئیدی کەلکی وەلامدانەوەی مرۆیان بەبەرەوە نامێنێ . بەلێ سەبارەت بەوە کە کلاسیکەکە لەو بارو دۆخەدا ئیدی بەفریای ئینسان ناکەوێ کۆن‌دەبێ . بەلام ستاندال وانیە . ستاندال ئیدی ناخوێنیدرێتەوە ، قسەی‌وا هەڵەیە . بەپێچەوانەوە ، ئەمڕۆکە ستاندال بگرە زێتر دەخوێندرێتەوە . نەخوێندنەوەی ڕۆمانی درێژ گۆیا لەم‌چەرخەدا ، ئەمەیش هەڵەیە . زۆر هەڵەیە ئەمڕۆکە تۆلستۆی سەرژمێری‌یەکی بۆ بکرێ لە هەموو نووسەرانی دنیا پتر دەخوێندرێتەوە . ئەوەشت لەبیرنەچێ چەرخەکەمان پتر دەخوێنێتەوە . کتێبی گیرفان لە ڕۆژاوا بە میلیۆنان دەفرۆشرێن . هەڵپەی کتێب‌فرۆشتنێکی بەسام لە دنیادا بەرچاو دەکەوێ . چونکە بنیادەم پتر فێرە خوێندەواری دەبن ، بە ژمارەی زۆر زۆر ، وە وەختیشیان بۆ فەراهەم دەبێ . من لام‌وایە ماوەی دە ساڵی تەلەفیزیۆن ، ئەوهەڵپەیەی مرۆ لە دە ساڵدا بۆ تەلەفیزیۆن تەماشاکردن بەخەرجی‌دەدا بابیی تەواوی ژیانیەتی . کاتێکی تەلەفیزیۆن هاتەگۆڕێ دەوری پێنج ساڵی سینەما لەباو کەوت‌و مرد . بەلام ئەوەتا ئەوڕۆکە سەرلەنوێ بە ڕمێن‌و ڕەوا کەوتۆتەوە . پێمان‌وایە ئێستا ڕۆمان لەباو کەوتووە . هەرچی تەماشای سینەما دەکا وادەزانێ . ئەمە هەڵەشەیە . هەر کە تەلەفیزیۆن داکەوت ، کتێب‌فرۆشتن زیادی‌کرد ، هەروا زیاددەکا . دە ساڵ لەمەوپێش وەبیرخۆ بێنەوە . ئەودەمی تەلەفیزیۆن « لە تورکیا -وەرگێڕ » پەیدانەببوو هێشتا ، نووسەران کتێبەکانیان لە سێ هەزار بەولاوە زێتر نەدەفرۆشران . کەچی ئێستا تەلەفیزیۆن پەیدابووە کتێب خۆ لە بیست و پێنج هەزار دەدا لە فرۆشتندا . ئەمە چۆن تەفسیر دەکرێتەوە ؟ گۆیا ڕۆمانی درێژ ناخوێندرێتەوە . « بازاڕی ئاسنگەران » ەکەی من شێست‌و پێنج هەزار ، حەفتاو پێنج هەزاری لێ فرۆشرا . لە هەموو ڕۆمانەکەمان بەبرەو ڕمێنتر بوو . ئەمە لە ماوەی چەندیشدا بلێ ؟ لە ماوەی ساڵ‌و نیوێکدا ، کەچی « ئەگەر مارەکە بکوژن » م کە کورتترین ڕۆمانمە هەرلەوکاتەدا « بازاڕی ئاسنگەران » ەکەم دەرچوو ، ئەویش کەوتە بازاڕەوە ، هەر پێنج هەزاری لێ فرۆشرا . « بازاڕی ئاسنگەران » م وائێستا لە ئێسوێچ دەردەچێ . دەبینین ، بزانن چۆن خۆی لە هەشتا هەزاریش‌و بەولاتریشەوە دەدا . لام‌وایە تا سەد هەزاریشی لێ دەفرۆشرێ . ئەوەشت لەبیرنەچی ولاتی ئیسوێچ ، سەرباریش ، ڕەهبەری ولاتە پشەسازی‌یەکانە . لە لووتکەدایە . چلەپۆپەیە . ئەم قسانەی دەیکەن لە بێ‌بەرپرسیاری‌یەتییەوەیە . جۆرە بەرەڵلایی‌یەکە . ئەوەت لەبیرنەچێ ، تا پیشەسازیی قورس پتر پێشکەوێ ، ئامێرو دەزگای جۆربەجۆر تا پتر گەشەبکا ، مرۆ هێندەی دیکەی وەخت بۆ پتر پاشەکەوت دەبێ . مرۆ تا دێ پتر دەبێ بە ڕۆمان ، پتر دەبێ بە شیعر ، پتر دەبێ بە مۆسیقا بەلام هەر کاتێکی گۆڕا ، گۆڕانەکەی بەشێوەیەکەی بوو ، لە ڕووی فیزیکی‌یەوە ، لە ئینسانەتی شۆڕایەوە ، ئەوساکە ڕەنگە هەر بەر بەلای ئەم جۆرە شتانەیشەوە نەکا . ئینسان کە خۆی نەگۆڕا ، بنیادی نەگۆڕا ، ڕۆمانیش کە پێداویستی‌یەکی ئینسانە ناگۆڕێ ، تا ڕۆژی قیامەتێ ئەرکی خۆی هەردەبینێ .

**- یەشار کەمال هەرچەند تا ڕۆژی قیامەت ناژی ، بەهەویام تا ڕۆژی قیامەتێ بخوێندرێیەوە .**

1977 / 7 / 25

« 1 » کۆشکی بلووری ، حیکایەتێکی دەماودەمی نێوخەڵکە . وەختی خۆی سەباحەددین عەلی نووسیویەتیەوەو بلاوی کردووەتەوە . نووسەرێکی بەناووبانگی کورد لەچلەکاندا کردوویە بەکوردی ، « لە عەرەبی‌یەوە » ، پاشان هەژاری موکریانی بەنێوی « بەیتی سەرەمەڕ » بلاوی‌کردووەتەوە . لەدیوانەکەیدا هەیە . « وەرگێڕ »

2 -بەداخەوە یەشار کەمال ئاگای لەکارەکانی مامۆستا شوکور نی‌یە -کاروان - .

« 3 » ماڵەغان : تریان ، گەرەنتوو ، جۆرە داسێکی دەسك‌درێژە بەپێوە دروێنەی پێ‌دەکەن .

